# با دەربچین لە تاریکایی سەرگەردانی


دانانی

محمد قطب

وەرگێرانی

ابراهیم حسن سعید



چاپی یەکەم

١٤٣١ك هەولێر ٢٠١٠ ز

**<u>ناسنامەی کتێب</u>**

**ناوی کتێب:  بادەربچین لەتاریکایی سەرگەردانی**
**دانانی : محمد قطب**
**وەرگێرانی : ابراهیم حسن سعید**
**چاپ: یەکەم/** 2010

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی هەولێر ژمارەی سپاردنی (  1185  )
ساڵی (2007)ی دراوەتێ



## پێشکەش کردن

* ئەم کتێبە پێشکەشە بە باوكو دایکی بەڕێزم ،کە من تەنها چاکەیەکی بچوکم لە چاکەکانیانو فەزلو منەتێکی زۆریان لەسەر منەوە هەیە خودا لێیان خۆش بێتو ڕوسپی دونیاو قیامەتیان بکات.

* پێشکەشە بەدایکی عومەر ،کە هەردەم منی هان داوەو یارمەتی داوم لەکاری چاکە خودا پاداشتی خێری بداتەوە.

* پێشکەشە بە هەموو ئەو بەڕێزانەی دەیخوێنەوەو سودی لێوەر دەگرن.

* بەتایبەت پێشکەشە بەگەنجو لاوانی موسوڵمانی ئەم کوردستانە بە کوڕو کچەوە چونکە هەر ئەوانن توێشوی زیندوون بۆ هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتەی ،کە ئاسمانەکانو زەویو چیاکان نەیان توانی هەڵیبگرن.

# سوپاس و پێزانین

- سوپاسی ئەو براو خوشکانەدەکەم ،کە یارمەتیان دام لەتایپ کردنی ئەم کتێبەو کارئاسانیان بۆ کردم خودا پاداشتی خێریان بداتەوە.
- هەروا سوپاسی ئەو برایانە دەکەم ،کە ئەرکی چاپ کردنی ئەم کتێبەیان گرتە ئەستۆی خۆیان چونکە من لەساڵی 2007 وە ژمارەی سپاردنم وەرگرتوە بەڵام لەبەر ئەوەی کەس نەبوو چاپی بکات بۆیە ئەوها دواکەوت ان شاءالله دواکەوتنەکەش خێری پێوەیە خودا پاداشتیان بداتەوەو لەتەرازوی چاکەکانیان تۆماری بکاتو ببێتە صەدەقەیەکی بەردەوام بۆیان.

## کورتەیەك لەژیانی مامۆستاو پێشەوا محمد قوتب

محمد قطب لەسالی 1919 لەشارۆچکەی موشا سەر بە پارێزگای ئە سیوط لەصەعیدی میسر لەدایك بووە، باوکی قطب ابراهیم یەکێك بووە لەجوتیارانی ئەم شارۆچکەیە ئەگەر چی قۆناغی سەرەتایی تەواو نەکردبوو،بەڵام یەکێك بوو لە رۆشنبیرانی ناوچەکەو جێگەی متمانەی خەڵکی بوو خەڵکی پرس‌و رایان پێدەکرد،دایکیشی فا طیمة عوسمان لەخێزانێکی خوا پەرست‌و زانست پەروەر بوو برایەکانی لەزانکۆی ئەزهەر دەیان خوێند لەوانە ئەحمەد حوسێن ،کە خاوەنی بەهرەی ئەدەبی‌و نووسین بوو شاعیرو ئەدیبێکی بلیمەت بوو لەڕۆژنامەکان بابەتی ئەو جێگەی تایبەتی خۆی هەبوو ،جا خاتو فا طیمة لەو نێوەندە زانستی‌و ڕۆشنبیریەدا پەروەردەبوو ،بۆیە هەڵسا سەیدو محمدی کوڕی ناردە قاهیرە بۆ ئەوەی خوێندنەکەیان لەوێ تەواو بکەن،محمد لەقاهیرە دەستی کرد بەخوێندن‌و قۆناغی سەرەتایی‌و ناوەندی لەوێ تەواو کردو پاشان چوە زانکۆو لەوێ بەشی ئینگلیزی‌و ئەدەبیاتی ئینگلیزی لەزانکۆی قاهیرە لەسالی 1940تەواو کردو،پاشان بەردەوام بوو لە پەیمانگای مامۆستایان‌و توانی بڕوانامەی دبلۆم لەپەروەردەو زانستی دەروونی بەدەست بهێنی.

محمد قطب بۆ ماوەی چوار ساڵ خەریکی وانە وتنەوە بوو هەروەها پێنج ساڵیش وەکو وەرگێڕ لە وەزارەتی مەعاریف کاری کردوو پاشان دوو ساڵی تر وانەی وتەوەو دواتر بووە سەرپەرشتیاری پرۆژەی هەزار کتێب لەوەزارەتی تەعلیم.

## کاریگەر بوونی بەبراکەی:

محمد  قطب  لەژیانی دا بەکەس ئەوەندە کاریگەر نەبووە ئەوەندەی بەبراکەی سەید کاریگەربووە ،کە هەر ئەو سەرپەرشتی کردوەو لەبەر خوێندنی داناوەو ئاراستەی کردوە ،جا سەید      — خوا لێی ڕازی بێت— وەکو باوکێی بەزەیی‌و برادەرێکی بەوەفا وابوە بۆ محمد قطب.

سەید بە12 سالّ لەمحمدی برای گەورەتربوو،محمدقوتب دەلّیّ:سەید زۆر هانی دەدام هەموو شتێك بخوێنمەوەو هەر ئەمەش وای کرد هەر لەتەمەنی منداڵیەوە حەزم لە خوێندنەوە بێت ،هەروا دەڵێت :من لەگەلّ بیرو هزرەکانی سەیدی برام دەژیام بەهەموو ئاراستەکانی ،هەر لەوکاتەی هەستم بەهۆشیاری خۆم کرد لەو کاتەی گەیشتمە قۆناغی ناوەندی ئەو منی بەشدار دەکرد لەگشت بوارەکانی بیرکردنەوەو دەرفەتی بۆ دەڕەخساندم بۆ ئەوەی گفتو گۆ بکەم لەبابەتە جیاوازەکان،بۆیە هزرو گیانمان تێکەلّ بەیەکتری بوو،ئەمە چ جای ئەوەی ،کە سەر بەیەك خێزان بووین.

## میحنەت و تاقی کردنەوەی خوای گەورە بۆ خێزانی قوتب:

خانەوادەی قوتب خانەوادەیەکی دین دارو ڕۆشنبیر بوو باش لەدینەکەی خوا شارەزابوون‌و دەیانزانی ،کە ئەوەی لەو سەردەمەو لەهەموو سەردەمەکان دەست بگرێت بەدینی هەق‌و بۆ خەڵکی ڕوونی بکاتەوە ئەوا تووشی تاقیکردنەوەی جۆراو جۆر دەبێت لەلایەن خوای گەورە،بۆیە بە متمانەیەکی بەهێزەوە هاتنە ناو گۆڕپان‌و ئەسپی خۆیان تیادا تاودا.پێغەمبەر —صلى الله عليه وسلم — فەرمویەتی((أشد الناس بلاء الانبياء ثم الامثل فالامثل يبتلى الرجل على حسب دينه فان كان فى دينه صلبا إشتد بلاؤه وان كان فى دينه رقة ابتلى على

قدر دينه فما يبرح البلاء بالعبد حتى يتركه يمشي على الارض بلا خطيئة)) حديث صحيح : واتە:پێغەمبەران لەهەموو کەس بەلآیان قورس ترە پاشان ئەوانەی لەخوارەوەی ئەوانن، هەر کەسێك بەگوێرەی دینەکەی تاقی دەکرێتەوە ،ئەگەر دینەکی بەهێزی هەبوو ئەوا بەلآیەکەی قورس تر دەبێ ،ئەگەریش دینەکەی زۆر بەهێز نەبوو ئەوا بەگوێرەی دینەکەی تاقی دەکرێتەوە ،بەردەوامیش تاقیکردنەوە لەبەندە ناگەرِێ هەتا لەسەر زەوی دەرِواو هیچ گوناهی نامێنێ)).

تاقیکردنەوەکانی خێزانی قوتب لەو کاتە سەریان هەڵدا کاتێك سەید قوتب لە ئەمریکا گەرِایەوە ،کە بۆ ماوەی ساڵێك لەئەمریکا بوو لەساڵی1949-1950 هەر کە سەید گەرایەوە پێنوسەکەی خۆی بەکار هێنا بۆ جەنگێکی سیاسی لە گۆڤارو رۆژنامەکان دژی دەسەڵاتدارانی ئەو کاتی میسر ئەمەش وای لێکرد خۆی دووچاری گرتن بکات.

کاتێك شۆرِشی یۆلیۆ لە ساڵی 1952 بەرپابوو کار گێرانی ئەم شۆرشە لەگەڵ هزری ئیسلامی تێك گیران ،کە خۆی لە برایانی موسوڵمان(الاخوان المسلمون) دەنواندو سەید قوتب یەکێك بوو لەبیرمەندەکانی ئەو کۆمەڵە، پەیوەندی سەید قوتب لەگەڵ کۆمەڵی برایانی موسوڵمان لەو کاتەوە دەستی پێکرد،کە لە ئەمریکا گەرِایەوە هۆیەکەشی ئەوەبوو کە سەید قوتب کاتێك لە ئەمریکا بوو حسن البنا تیرۆر کرا جا لەوێ ئاهەنگێکیان گێرِا بەبۆنەی تیرۆر کردنی بۆیە هەر لەو کاتەوە برِیاری دا ببێتە یەکێك لەئەندامانی ئەم کۆمەڵە.

لەساڵی 1953سەید قوتب بانگهێشت کرا تاکو بەشداربێت لەلیژنەی دامەزراندنی برایانی موسوڵمان هێندەی پێنەچوو روداوی مەنشیەی بەناوبانگ لەساڵی 1954 دورست کرا کاتێك جمال عبد الناصر کۆمەڵی برایانی تاوان بار کرد بەوەی هەوڵیان داوە تیرۆری بکەن،بۆیە سەید قوتبو سەرکردەکانی برایانی

موسوڵمان دەسگیر کران کە لە نێوانیان محمد قوتبیشی لەگەڵدابوو، لەزیندانی حەربی هەریەك لەو دوو برایە بەتەنیا بەند کرابوون بۆ ئەوەی ئاگایان لەیەکتر نەبێ .محمد قوتب دەڵێ: فیتنەی زیندانی حەربی زۆر کاریگەری خراپی هەبوو لەسەر دەروونم ،چونکە ئەمە یەکەم تاقیکردنەوەی ژیانم بوو بەجۆرێك ئازارو ئەشکەنجەیان دەدام ،کە هەر گیز لەیادم ناچێت،بەڵام پاش ماوەیەك محمد قوتب ئازاد کرا لە کاتێك سەید 15ساڵ بڕیاری زیندانی بۆ دەرچوو،کە لەو ماوەیە بوو سەید (في ضلال القرآن) ی نووسی ،محمد قوتب باسی ئازاد کردنی دەکاتو دەڵێت:ئەو ڕۆژەی لە زیندان دەرچووم هەڵسام بەلەکۆڵکردنی بەرپرسیاریەتی خێزانەکەم ،کە پێشتر برا گەورەکەم لەئەستۆی گرتبوو بۆیە بۆ ماوەی 10 ساڵ بە چەندین تاقیکردنەوەی ناخۆش تێپەڕیم ،لە ساڵی 1964 سەید بە لێبوردنێکی تەندورستی ئازاد کرا ،بەڵام بەپێچەوانەوە محمد قوتب ڕەش بین بوو بەرامبەر ئەو ئازاد کردنەی سەیدی برایو وتی: ئەو بڕیاری ئازاد کردنەم بە دوو دڵیەکی زۆرەوە وەرگرتو دەم زانی ئەو ئازاد کردنەی پیلانێکی توند تری بەدواوەیە کە لەزیندان کردن خراپ ترە ،جا ئەوەی محمد قوتب بۆی چوو ڕاست دەرچوو پاش تێپەربوونی ساڵێك بەسەر ئازاد کردنی بارودۆخەکان دووبارە تێکچوونو جمال عبد الناصر لەساڵی 1965 هەڵسا بەدەرکردنی بڕیاری دەست گیر کردنو ڕاوەدوونانی ئەندامانی کۆمەڵی برایان ئینجا دووبارە سەید قوتبو محمد قوتبی برای دەست گیر کرانەوە بەڵام ئەم جارە ماوەی زیندانی محمد قوتب درێژەی کێشا بۆ ماوەی شەش ساڵ واتە لەساڵی 1965 هەتا ساڵی 1971 بەڵام سەید قوتبو شەش سەرکردەی تری برایانی موسوڵمان شەهید کران لەسالی 1966 لەبەرە بەیانێکی زوودا فیرعەونی میسری ژەهری خۆی ڕژاندو خۆی شەرمەزاری خوای پەروەردگارو مێژوو کرد ،جا لەماوەی ئەو ڕوداوانە

خانەوادەی قوتب دوچاری ڕاوەدوونانو لەناو بردنو ئازارو ئەشکەنجە بوونەوە ،لە ئەنجامی ئەو قەسابخانانەوە کوڕە خوشکێکی محمد قوتب لەژێر ئەشکەنجە شەهید کراو هەر سێ خوشکەکەشی دەست گیرکران.

قۆناغی ئازاد کردنی ئەندامانی برایانی موسوڵمان لە زیندانەکانی جمال عبد الناصر وەکو کۆچ کردنێکی بەکۆمەڵی ئیخوان بوو لە میسر ،محمد قوتب یەکێك بوو لەوانە کە تاکو ئەمڕۆ لەوڵاتی سعودیە نیشتەجێە ، محمد قوتب وەکو مامۆستایەك لەکۆلیژی شەریعەی زانکۆی ام القری وانەی وتەوە پاشان لەزانکۆی شا عبد العزیز لەشاری جدە.

محمد قوتب هۆکارێکی ئیجابی بوو لەدامەزراندنی قوتابخانەیەکی ئیسلامی پر لەجمو جۆڵ لەنێو زانکۆکانی سعودیە ئەویش لەئەنجامی سەرپەرشتی کردنی نامەی زانکۆی هەمە جۆر کە توانی پەیوەندی نیوان قوتابخانەی شێخ محمد عبد الوهابو کێشە هزریو بزووتنەوە هاو چەرخەکان توندو تۆڵتر بکات ،لەساڵی 1988 محمد قوتب خەڵاتی شا فەیصەلی جیهانی بۆ لێکۆلینەوەی ئیسلامی پێ بەخشراو لە بەرواری 1\9\2009 دا توشی جەڵتەیەکی دەماغی بوو بەڵام سوپاس بۆ خوا سەلامەت بوو هەتا ئێستاش وا لەژیاند ماوەو پێنووسە پیرۆزەکەی لەکار دایە بۆ خزمەت کردنی ئیسلامو موسوڵمانان .

## مەنهەجی فیکری محمد قوتب

محمد قوتب ناسراوبوو بە ڕەخنە گرتنی بیٚ ئەندازە لەڕۆژ ئاواو شارستانیەتیانو هزرو بیریان ، لەو کاتەی بیری مارکسیەتو لیبرالیەتو سۆشیالیستی لە نێو ولآتانی ئیسلامی بلآو بوو زالّ بوو بەسەر زۆربەی لایەنە فیکریو ڕاگەیاندنەکانو بیردۆزەکانی ئەم ڕێچکەو بیرو هزرانە لەزانکۆان دەخوێنران ،لێرەمحمد قوتب چەند کتێبی نووسی لە ڕەخنە گرتن لەم هزرو بیرو باوەڕو ڕژێمانەو ئەوانی بەنەگەنجاوو نامۆ زانی لەمەرتەتبیق کردنی لەجیهانی عەرەبیو ئیسلامی،محمد قوتب زۆربەی ژیانی خۆی لەوانە وتنەوەو وتارو نووسینو سەرپەرشتی نانەی زانکۆیی بردوتە سەر بۆیە خاوەن بەرهەمێکی بیٚ سنورە ،کە خۆی لە نزیکەی 30 کتێب دەبینێتەوە،لە گرنگ ترین ئەو کتێبانەی نوسیویەتی ،کە بەلّگەیە لەسەر ئەو نوسەرە ڕووناکبیرە کتێبی ( جاهلية القرن العشرين)ە کە تیایدا خوێندنەوەیەکی تەواو بۆ نوێخوازی ڕۆژئاوا دەکاتو،بەنەفامی دووەمی دادەنێتو دەلّێت : ئەم نەفامیە لە لاڕێبوونو گەندەلّیو گەمڕاییدا وەکو نەفامیەتی عەرەبەکانە پێش هاتنی ئیسلام، ئەو لەکتێبی (مذاهب فكرية معاصرة)دا روانینێکی زانستی ڕەخنەیی پێشکەش کرد بۆ ئەو مەزهەبانە ،کەلەمەدا ئیعتیمادی کردبووە سەر خوێندنەوەیەکی قولّ بۆ وتە تیۆریەکانیو تەجروبە واقیعیەکەی، بۆیە ئەو کیتابە بووە سەرچاوەیەکی سەرەکی ، بەجۆرێك بووە مەنهەج لەزۆربەی زانکۆکانی جیهانی عەرەبیو ئیسلامی،لە کتێبی (حول التفسير الاسلامى للتاريخ) مێژوو نووسە موسولّمانەکان بانگەشە دەکات ،کە دووبارە بەهزریکی ئیسلامی مێژووی مرۆڤایەتی بنوسنەوە

بۆ ئەوەی ئەو کەلێنە پڕ بکەنەوە ،کە لەنێوان بیرو باوەڕی ئەممەتو خوێندنەوەی مێژوو هەیانە، محمد قوتب ئەوا 90 ساڵە لەمیانی کتێبەکانی کۆشش دەکات بۆ ئەوەی تەفسیری واقیع بکات لە ڕوانگەیەکی ئیسلامیو بە مونتلەقێکی زانستیو موخالیف بە تیۆری زانستی ڕۆژئاوا.

## منداڵەکانی محمد قوتب

محمد قوتب کتێبەکانی وەکو منداڵەکانی خۆی دادەنێ .. لە چاو پێکەوتنێکی ڕۆژنامە نووسی پرسیاری ئەوەیان لێکرد ،کە ئایە خۆشەویسترین کتێب لەلای ئەو کامەیانە؟ لەوەڵامدا وتی: من کتێبەکانم وەکو مناڵەکانی خۆم سەیر دەکەمو هەموو لەلام خۆشەویستن ،بەڵام کتێبی (الانسان بین المادية والاسلام) کە نۆبەرەی کتێبەکانمە دایدەنێم بەخوشەویسترینیانو هەروا کتێبی(جاهلية القرن العشرين) پلەو پایەکی تایبەتی لەدەرونمدا هەیە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ڕوانینی من دەردەخا لەمەڕ حەقیقەتی نەفامی ،کە سنوردار نیە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ، بەڵکو حالەتێکە بۆی هەیە لەهەموو زەمانو مەکانێکدا ڕوودبداو ئەمرۆش مرۆڤایەتی لەنێو سەختترینو قێزەونترین نەفامیدا دەژیت.

لە کۆتایدا هەزاران رەحمەت بۆ گیانی پاکی سەید قوتبی موفەسیرو نووسەرو لەش ساغیو تەمەن درێژی بۆ مامۆستاو پێشەوا محمد قوتب ،کە ئەوانە خۆیان وەکو چرایەك لێکرد بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگای ڕاستی ئیسلامو بەرەنگار بوونەوەو بودەڵ کردنەوەی تیۆرو هزرە دەست کردەکانی مرۆڤو هەروا دیار خستنی ڕوی ژیارە ساختەکەی ڕۆژئاوا،کەتاکو ئێستا هەندێك لەموسوڵمانان پێی هەڵخەڵەتاونو پێی سەرسامن.

## پەراوگەی محمد قوتب

1 دراسات في النفس الإنسانية.

2- التطور والثبات في حياة البشرية.

3- منهج التربية الإسلامية (بجزئيه: النظرية والتطبيق).

4- منهج الفن الإسلامي.

5- جاهلية القرن العشرين(1965).

6- الإنسان بين المادية والإسلام(1951).

7- دراسات قرآنية.

8- هل نحن مسلمون؟(1959).

9- شبهات حول الإسلام.

10- في النفس والمجتمع.

11- حول التأصيل الإسلامي للعلوم الاجتماعية.

12- قبسات من الرسول(1957).

13- معركة التقاليد.

14- مذاهب فكرية معاصرة.

15- مغالطات(2006).

16- مفاهيم ينبغي أن تصحح.

17- كيف نكتب التاريخ الإسلامي؟.

18- لا إله إلا الله عقيدة وشريعة ومنهج حياة.

19- دروس من محنة البوسنة والهرسك.

20- العلمانيون والإسلام.

21- هلم نخرج من ظلمات التيه.

22- واقعنا المعاصر.

23- قضية التنوير في العالم الإسلامي.

24- كيف ندعو الناس؟.

25- المسلمون والعولمة.

26- ركائز الإيمان.

27- لا يأتون بمثله !.

28- من قضايا الفكر الإسلامي المعاصر.

29- حول التفسير الإسلامي للتاريخ.

30- الجهاد الأفغاني ودلالاته.

31- دروس تربوية من القرآن الكريم.

32- حول تطبيق الشريعة.

33- المستشرقون والإسلام.

34- هذا هو الإسلام.

# با دەربچین لە تاریکایی سەرگەردانی

ئەمە بانگەوازێکە بۆ گشت ئەو ئوممەتەی بە زووبانی وشەی لا الله الا الله محمد رسول الله دەدرکێنێ.

بەڕاستی هەر ئەم وشە گەورەیە یەکەم جار ئەو ئوممەتەی هێنایی بوونەوە ،هەرئەوە بوو بەرزی کردەوە بۆ پایەکی زۆر بەرزو پڕخێر لە سەر هەموو ئوممەتەکانی زەوی‌و هەموو ئوممەتەکانی مێژوو ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴿١١٠﴾ ﴾ آل عمران: ١١٠ ئێوە چاکترین مرۆڤن لە ناو مرۆڤی دنیادا سەرو هەڵدا فەرمان بە چاکە دەدەن و ڕێ لە ناڕەوا دەگرن،باوەڕیشتان بە خوا هەیە.

هەر ئەم وشەیە بوو پاڵی نا بۆ جمو جۆڵ کردن لە هەموو بوارێك لە بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتی،کەلە هەموو گۆڕپانەکان گەیاندیە پلەی سەرکەوتن : لەجەنگی‌و سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و هزری‌و ڕەوشتی و ڕۆحی،کەوای کرد ناوو دەنگێکی گەورەی ببێت لە زەمیندا پاش ئەوەی ، کە لە پەراوێزی مێژوو بوو!

بەڵام وتنی وشەی لا الله الا الله بە تەنیا ئەم هەموو شتانەی دروست نەکرد!

بەڵکو وتنی بە زووبان و ڕاستی و یەقینی ئەم وشەیەی ،کەدڵەکانی پڕکردبوو،کردوە بە داخوازیەکانی بوو، کە ئەم هەموو شتە سەیرو سەمەرانەی دروست کرد، کە مێژووش تێی گەیشت بۆ هێنانە دی بەڵێنی خوا ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن

قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ﴿٥٥﴾ ﴾ النور: ٥٥: خودا لەوانەی بە ئێوە باوەڕیان هەیە وئاکار جاکن بەلێنی دالەم زەمینەدا دەیانکاتە جێگە نشین هەروەکو چۆن ئەوانەی بەرلەوانی کردە جێنیشین. دینەکەشیان– کە خۆی پەسەندی کردوە– هەر بۆیان دادەمەزرێنیٚ و ترسە کەشیان بۆ دەکاتە دلْنیایی تا بە تەنیا من بپەرستن و ، هیچ شتێکیش بە هاوەڵی من نەزانن.

پێشتر ئوممەت بە هەموو قەوارەکەی لە جیهانی واقیعیدا دەژیا ، بەلاّم خۆی خەرماندا لە جیهانی خەیاڵەوە ! ئەمڕۆش.. واقیعەکە چەند دوورە لە خەیاڵ ! بەڵکو واقیعەکە کە چەند دوورە لەو ڕاددە کەمەی ،کەئوممەت نابیٚ زیاتر لیٚ ی داببەزیٚ !

ئەمڕۆ ئوممەت کوێرانەو بیٚ ڕێنمایی چووە ناو تاریکیەکانی سەرگەردانی..مەگەر ئەوەی خوا بە زەیی پیٚ هاتبێتەوە !

بەڕاستی خوای گەورە ئوممەتێکی پێش ئێمەی بە سەرگەردانی تاقی کردەوە ﴿ أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الأَرْضِ: ماوەی چل ساڵ بەشیان لەو وولاّتە بڕاو لە زەمیندا وێلاّن و سەرگەردان دەبن﴾ سورەتی مائدە : 26

هۆی ئەم تاقی کردنەوەیەش ئەوە بوو ،کە ئەو ئوممەت تەمبەڵی کردوو کەم تەرخەمی نواند بەرامبەر فەرمانی خوا،کەئاڕاستەیان کرابوو بۆ چوونە ژوورەوەی زەوی پیرۆز (الارض المقدسة ) : ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَـٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَـٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟

مِنۡهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾ المائدة: ٢٠ - ٢٦ : **ئەو دەمانەش کە موسا بە هۆزی خۆی گووت : گەلۆ ! دەبێ هەرگیز ئێوە ئەو چاکەیەی لە بیر نەکەن کە خودا دەربارەی کردوون — کە ئەو هەموو پێغەمبەرەی هەر لە ناو خۆتان بۆ ناردوون چەندین پادشای لە خۆتان پەیدا کردووەو ئەو شتەی بە ئێوەی داوە ، بە هێچ کەسێ لەم دنیایەدا نەداوە . گەلۆ بچنە سەر ئەوزەمینە پیرۆزەی خوا بۆ ئێوەی بڕیار داوەو بۆ نووسراوە بەرەو پاش مەگەڕێنەوە . گەر لە پەیمان خۆ ببوێرن ، بەزیانتان تەواو دەبێ .گووتیان موسا ! مرۆیەکی زۆردارو مل هوڕ لە وێدان . تا ئەوانەی لێ دەرنەچن ، ئێمە ناچینە ناویەوە ئەگەر ئەوان لەوشوێنانە بچنە دەرێ، ئەوساکە دەچینە ناوی . دووپیاو لەوانە وا لەخوا دەترسان بەر چاکەی خودا کەوتبوون ، پێیان گووتن : لە دەروازەی شار بچنە ژوورەوەو هێرشیان بۆ بەرن، هەر گا پاتـان خستە ئەودیو، سـەرکەوتن بەشـی ئێوەیە . ئەگەر ئێوە بڕواتـان بە خوا هەیە ، خۆتان بەخودا بسپێرن. گووتیان: موسا ! هەتا ئەوان لەو شوێنە بن ، ئێمە هەرگیز زات ناکەین بچینە ئەوێ . ئەوا خۆت و پەروەرندەت بچـن دەگـژیان ڕابچـن و چاریان بکەن ، ئەوا ئێمە لێرە نیشتوین چاوەنۆڕین . موسا گوتی : پەروەرندەم ! تۆ دەزانی کە من دەستم هەر بەسەر خۆم و برابەکەمدا ڕادەگاو (ئەوانە بە قسەی من ناکەن ) سا تۆ من و ئەو هۆزە**

نافەرمانەی (من ) لە یەکتر جیا کەوە . گووتی: ئەوا ماوەی چل سالّ بەشیان لەم وولأتە دابڕاو لە زەمیندا وێلأن و سەرگەردان دەبن . بۆ ئەم هۆزە نافەرمانە لە ڕێ دەرچووە خەم مەخۆ﴾.

ڕەنگە حیکمەت و دانایی ئەو سەرگەردانیە ئەوە بێت ، کە ئەو گەلە ژێر دەست و چەوساوەیە ، ئەوانەی لەسەر سەرشۆڕی پەروەردە ببوون بۆ فیرعەون ، بە کەڵك هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتەی کەپێیان ڕاسپێردرابوو هەڵی بگرن نەدەهاتن بەو شێوەیەی، کە شایەن بن بۆ هێنانەدی وتەحقیق کردنی پەیام و ڕێبازی خوا لە زەمین ، بۆیە لەم ماوە دیاری کراوەدا خودا تاقی کردنەوە بەم سەرگەردانیە،کەتیایدا ئەونەوە سەرشۆڕو زەبوون و چروکە کۆتایی پێ هات و ، نەوەیەکی تری نوێ لەدایك بوو.. لەناو سەرگەردانی لە دایك بوون..لە ناو ناخۆشی و ناڕەحەتی .. لە ناو ئێش و ئازارو دەردو بەلأ بۆیە خوای گەورە مۆڵەتی دان بۆئەوەی بچنە ناو زەوی پیرۆز (الارض المقدسة) وجێگیریشی کردن لەزەوی. ئەمڕۆش ئوممەتی ئیسلامی لەناو سەرگەردانی دەادەژی .بەلأم سەرگەردانەی مەعنەوی نەك ئەو سەرگەردانیە ماددیەی ،کە نەوەی ئیسرائیل لەنێویدا ژیا .سەرگەردانی لە هزرو هەستەکان و بیروبۆچوون و شێوازی هەڵس وکەوت .ئەم تاقی کردنەوەیش لەلایەن خوایەوە بوو کاتێك ئەو ئومەتە خۆی گنخاند لە مەڕ هەڵگرتنی ئەو پەیامەی ،کە پێی ئەرك بار کرا بوو،کە هەموو خێروبێرێکی لەناو ئەو پەیامەدابۆدانابوو لە نێویشی دا ئەرکەکەی بۆدیاری کردبوو ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة: ١٤٣ بەم ئاوایە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئومەتێکی هەڵبژاردە تا ئاگاو لە مەردم هەبێ و پێغەمبەر یش چاودێرتان لێ بکات. زیاتر لەسەدەیەك

ئەم سەرگـــەردانیە دەستی پێکردبوو ،کاتێك ئەوئوممەتە شەریـــعەتەکەی خۆی لاداو ،چەند شەریعەتێکی تری لەباتی دانا،کەخوای گەورەهەواڵی دابوێ ئەم شەریعەتانە نەفاممین چونکە حوکم ناکات بەوەی خوا ناردیتیە خوارەوە، بەهاو ڕەوشت و شێوازی هەڵس وکەوتی گۆڕیەوە بەبەهاو ڕەوەشت و شێوازو هەڵس وکەوتی ڕۆژئاواو پشتیشی وەرگێڕا لە کیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیەوسلم بۆ ئەوەی سیستم و هزرو ئایدۆلۆژیاو ڕێبیرەکان ئیستیراد بکات لەو شوێنەی ،کە گومانی برد جێگای بەرز بوونەوە و پێشکەوتن و شارستانیەتی ڕاستیە .

تووشی فیتنەهاتنیش بەهۆی ڕۆژ ئاواوە– لەپاش ئەو سەرسامیەی ئوممەت تووشی هات لەگەڵ ئەو شکستیە سەربازیەی ڕووبەڕوی بۆوە– سەرەتای ئەو سەرگەردانیەبوو کەوا ئوممەت لە میحنەتەکەی پێی تاقی کرایەوە .

پێش ئەوە ئوممەت تووشی زۆر دەردو نەخۆشی هاتبوو،کە وێك هاتبۆوەو ، بەرتەنگ ببۆوەو ،خۆی لەناو پۆشاکی خۆی نابۆوەو ،ئەو پاشماوەی لە ئایین بۆی مابۆوە لە باوەشی دەگرت وای دەزانی لەسەر دینەکی ڕاستە.پاشان نەخۆشیەکانی بەرەو توند و سەختی چوو هەتا نزیك بوو لەماندوێتیو شەکەتی بکەوێتە خوارەوە ،ئەگەر چی ئەو هەر لە جێگای خۆی گیرسابوو جوولەی نەدەکردو،بەڵکو بیریشی نەدەکردەوە لەگۆڕینی ناسنامەی خۆی و قەبوڵیشی نەدەکرد کاتێك بانگ دەکرا بۆ خۆگۆڕین .پاشان – لە ناکاو – دوای دۆڕاندی سەربازی بەرامبەر ڕۆژئاوا – ئەوەی هەیبوو لەپاش ماوەی دین لە ترسان هەمووی لە خۆ داماڵاند ،بەڵام بەبێ ڕێنمایی لەو دینەی ،کە سەدەکانی پێش ئێمە پێی ژیان ،کە سەروەری و هێزو دەستەڵاتی لەم دینەوە بەدەست دەکەوت کاتێك ،کە بەتەواوی لە سەر ڕێنمای و چاوساغی دەستی پێوە گرتبوو ..ئێستاش

– لە سەرەتای کاریدا ئەخولێتەوە لە ناو سەرگەردانیو ،دەگەڕێت لە ڕێنمایی و تروسکایەك لەو شوێنەی کە تییایدا نایبینێتەوە بەدەستی ناکەویٚ!

ئوممەت زیاتر لە سەدەیەك ماوە لە ناو سەرگەردانی ...

پاشان سوپاس بۆ خوا ڕابوون هاتو ..دێدەوانی ئەم ئومەتە دەستیان بە دەرچوون کرد لەناو سەرگەردانی بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەی هیدایەتی ڕاستەقینەو سەرچاوەی هێزی ڕاستەقینە ،کە ئەمانە ماوەیەك ئاگای لێنەماو ماوەیەکیش وازی لیٚ هێنا کاتێك لە ناو سەرگەردانی ئەخولایەوە .

بەڵام هێشتا ڕابوون لە سەرتای ڕێگادایەو ، ڕێگایەکی دوورو درێژی لە بەردەمە دەبیٚ بیبڕی بۆ هێنانەدی ئامانجەکانیو هێشتا خەڵکێکی زۆریش لە ناو سەرگەردانی ماوەتەوەو تیایدا دەڕوات .

دەبیٚ خودای گەورە چەند کاتی تەرخان کردبێت بۆئەوەی ئەو ئوممەتە لە ناو سەرگەردانی بەسەری ببات ؟ ئەمە غەیبەو تەنیا خوا دەیزانی ..بەڵام ئێمە وامەزەندە دەکەین ،کەکاتی هاتووە بۆ ئەو ئوممەتە خۆی دەربێنیٚ و ڕزگاربکا لەم سەرگەردانیە . ئەگەر کەوتنە ناو فیتنەو ئاشوب بەهۆی ڕۆژئاواوە لەسەرەتادا ئەوە ئەو ئومەتەی هاوێشتە ناو سەرگەردانی ، ئەوە وا مەزندە دەکەین ،کە ئەمڕۆ ڕۆژئاوا حەقیقەت و ڕاستیەکەی ئاشکرا بووە بەجۆرێك ،کە ئەوەی کەمترین بینین وزانیاری هەبێت بە چۆنیەتی هەڵسوڕانی کاروبارەکان ئەوا هەستی پێدەکات .

ئەو دڕندایەتیەی خاچ پەرستان ئەنجامیاندا لە بۆسنەو هێرسك وپاشان ئەو بێدەنگ بوونە ڕیسوابووەی ڕۆژئاوای خاچ پەرست مومارەسەی کرد لەبەرامبەر ئەو دڕنداتیە گەللۆریە ، دەبیٚ هەرگیز بۆ هەموو مرۆڤێك دوو ڕاستی زۆر گەورە ئاشکرا بکات: **یەکەمیان**، کە ڕۆژئاوا چەندە ڕقو قینی شاراوەی لەدەروون دایە بەرامبەر ئیسلام وموسوڵمانان **دووەمیان:** بڕی ساختە چەندە لەو شارستانیەتەی

كە ئەو ئوممەتە گومانی برد شارستانیەتەكی مرۆڤایەتیەو هەڵدەستێ بەرێز گرتنی بەرامبەرو پێدانی مافی لەبووونداو ،مافی لە دەربرِینی ئەو بوونەدا، بەراستی رۆژ ئاوا گەورەترین شارستانیەتی درۆیینە لەمێژوو . .سەرەرای هەموو تەكنەلۆژیاو پێشكەوتنی زانستی و ماددی وگیشتنی بە مانگو مەریخ . . چونكە — بەتەنها — ئەمانە شارستانیەت دورست ناكات ،ئەگەر چی زانست وتەكنەلۆژیا لەپێداویستیەكانی هەرە گرنگی هەموو شارستانیەتێكە . .بەڵكو شارستانیەتی هەق وراستی ئەوەیە،كە مرۆڤ لەناخو گەوهەردا بەرز بكاتەوە .

بەرزی بكاتەوە لە هەموو قەوارەكەی نەك تەنها لە لایەنێكی بەڵكو لە هەموو بوارەكانی ژیانیدا هەروەكو خوای پەروەردگار فەرموویە باوەرِدارەكان ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٢٠٨ ﴾ البقرة: ٢٠٨: ئەی گەلی خاوەن باوەرِان !هەموو لاتان ئامادەی فەرمانبەری بن.پێ مەنێنە جێ پای شەیتان ئاشكرایە كە شەیتان پێتان دوژمنە.

﴿ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ ﴾ یانی هەمووتان برِۆنە ناو ئیسلامەوە،واتە بە تێكرِایی هەمووتان،بە تێكرِایی هەر تاكێكتان ..بە تێكرِایی دەروونی و عەقڵی و هەستی و ویژدانی و رِێگای هەڵسوكەوتی جا هەر بەشێك لە قەوارەی ئەو مرۆڤە نەچێتە ناو ئەو ئیسلامەی خوا ئەوا دەبێتە خۆراك بۆئەو شەیتانەی هەردەم لەكەمین دایە بۆ ئەوەی مرۆڤ بە خێرایی لەو ئیسلامە لە دونیا دەربێنێ و لە رِۆژی دواییدا بیخاتە دۆزەخ ﴿ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡۖ وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ ١٧ ﴾ الأعراف: ١٧: وتی:چونكە لەرِێ لات دام منیش بۆیان

ڕۆدەنیشم ڕاستە ڕێی تۆیان لێدەگرم. ئەوجا لەپێشو پاشەوە بۆیان دەچم ڕاستوچەپیشیان  لێدەگرم جا دەبینی زۆربەیان شوکرانە ناکەن.

دڕندایەتی خاچ پەرستان لە بۆسنەو هێرسك و ئەو بێدەنگ بوونە ڕیسوا بووەی ڕۆژئاوا مومارەسەی کرد لە بەرامبەریدا ئەم دووانە سەنگ و مەحەکی ڕاستین بۆ ئەم شارستانیەتە ساختەیە.ئەو سەنگ و مەحەکەی مەعدەنە ڕاستییەکەی ئاشکرا دەکاو ئاشکرای ئەوەش دەکا،کە چەند لایەنی لەژیانیدا بەجێهێشتووە بۆ ئەوەی ببێتە خۆراکی شەیتان.لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە یەکەم دڕندایەتی نییە کە جیهانی شارستانی مومارەسەی کرد یان بە بێدەنگ بوونێکی ڕیسوابوو لە بەرامبەریدا بێدەنگ بوو ، یان بەئاشکراو نهێنی دەستخۆشی لێکرد و پیرۆزبایی لێکرد،قەسابخانەی تاجیکستانو دڕندایەتییەکەی چیوایان کەمترنییە، دڕندایەتی قەسابخانەکانی هیندو کشمیر چیوایان کەمتر نییە، دڕندایەتی قەسابخانەکانی فلپین چیوایان کەمتر نییە.یان بێجگە لەم قەسابخانانەو هی دیکەش لە هەموو ناوچەکانی زەوی دا.

بەڕاستی کاتی ئەوە هاتووە بۆ ئەو ئوممەتەی هەڵخەڵەتاوە بەڕۆژئاوا بەئاگا بێتەوەو خۆیان دەربێنن لە تاریکیەکانی سەرگەردانی. ئەگەربێتو سەرسام بوون بە ڕۆژئاوا– کەلە بنچینەدا لە بەتاڵی عەقیدەو بیروباوەڕەوە دروست بوو کە لەماوەکانی پێشودا ئوممەت لە نێویدا ژیا– سەرەتای سەرگەردانی بێت ،ئەوە با ئاشکرابوون وبەدەرکەوتنی ڕاستو دروستی ڕۆژئاوا ببێتە دەسپێکی دەرچوون لەو سەرگەردانییەی کە هێشتا لەناوی دا دەڕوات..بە هیچ شێوەیەکیش مرۆڤ بەتەواوی دەرناچێت لە سەرگەردانی هە تا بە تەواوی و بەتێکرایی نەچێتە ناو ئیسلامی خوا.. ڕاستی لااله الاالله محمد رسول الله.

ئەم بانگەشەیە ئاڕاستە کراوە بۆهەمووی ئوممەت بۆ ئەوەی دەربچێت لە سەرگەردانی و بکەوێتەوە سەر ڕێگا...بەڵام بە شێوەیەکی تایبەت ئاڕاستە کراوە بۆ گەنج و لاوانی ڕابوون ، چونکە هەر ئەوان ئەو سەربازەن ،کە ئوممەت ڕێنمایی دەکەن بۆ ڕێگاو ئاسانکاری بۆ دەکەن بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە لایو بەناویدا بڕوات ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ﴿١٥٣﴾ ﴾ الأنعام: ١٥٣: ئەمەیە ڕێگای ڕاستی من، ئێوە هەر بەو ڕێگایە بچن و مەچنە سەر ڕێگایانی ترنەوەك لە ڕێگای ئەو دوورتان خاتەوە.

ئەم چەند لاپەڕەیەم بەکورتبڕیەکی زۆر نووسی بۆ ئەوەی ڕوونی بکەمەوە کە چۆن ئەو ئوممەتە چووە ناو سەرگەردانی و قەبارەی ئەو سەرگەردانیەچەندە ،کە لە ماوەیەك لە ماوەکاندا هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتەوە: بگرە لە لایەنی روحی و هزری و ڕەوشتی و سیاسی و ئابووری و کۆمەلأیەتی. پاشان ئەو ڕۆڵەی کە ڕابوونی پیرۆز پێی هەڵسا هەتا وەکو ئەم ساتو کاتە سەرەڕای ئەو هەموو کەم و کوڕی و ساتمانەی هەیەتی پاشان بەئیزنی خوا وێنەی بەیانیەکی بە ئومێدو هیوا کاتێك ڕابوون پێدەگاو توکمە دەبێو ئوممەتیش بە تەواوەتی دەردەچێت لە تاریکییەکانی سەرگەردانی و قایم بوون و جێگیربوونی لەسەر ئەم زەوییە بۆدەگەڕێتەوە بە گوێرەی وەعدو بەڵێنی بەردەوامی خوا ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا ﴿٥٥﴾ ﴾ النور: ٥٥

خودا بەوانەی لە ئێوە بڕوایان هەیەو ئاکارچاکنبەڵێنی دا لەم زەمینە دەیانکاتە جێگەنشینهەروەکو چۆن ئەوانەی بەرلەوانی کردە جێنشین–

دینەکەشیان–کە خۆی پەسندی کردووە–هەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی {تا}تەنیا من بپەرستن﴾.

خوای گەورەش بەرپرسیارە لە ڕێپیشاندانی ئوممەت بۆ دەروازەیەکی ڕاست بۆ چوونەدەری لە سەرگەردانیو هەر ئەویش بەرپرسیارە لە دیتنەوەی ڕێگایەکی هەق و ڕێبازێکی ڕاست بۆ ئەوەی پێیدا برۆن ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ یوسف: ١٠٨ بێژە: ئەمە ڕێگای منە هەم خۆم و هەم ئەو کەسانەش شوێنم کە فتوون – بە بەڵگەوە – بۆ خواناسی بانگی دەکەم.خواش هەمیشە پاکەو تاکەو لەوانەنیم کە شەریکەی بۆ پەیدا بکەم﴾.

**محمد قطب**

## چۆن چووینە نێو سەرگەردانی ؟

بەڕاستی جەنگی خاچ پەرستەکان لە بۆسنەو هێرسك ،کە لەو ڕۆژانەی بەودواییە گەیشتە ترۆپکی ئەوا لە ڕاستیدا پێش چەند سەدەیەك لەمەوبەر دەستی پێکردووە..دەتوانین بە شێوەیەك دیاری بکەین ،کە ئەم جەنگە کاتێك دەستی پێکرد کە موسڵمانەکانیان وەدەرنا لە ئەندەلوس .کە دواین وڵاتی ئیسلامی ڕووخا لە ئەندەلوس لە ساڵی 1492[1] زیاش ئەوەی دادگاکانی پشکنین(محاكم التفتيش) زۆر بێ ئابڕوانە کاریان کرد بۆ لەناوبردن و قەڵاچۆکردنی موسوڵمانان و کۆتایی پێهێنانێکی بە تەواوی لەو شوێنەدا بەسەر ئیسلام و موسوڵمانان.پاشان پاپا فەرمانی دا لە دەرەوەی ئەندەلوسیش شوێن موسوڵمانان بکەون بۆ ئەوەی بە زەبری شمشێر نەصرانیەتیان بەسەردا بسەپێنن ، ئەو گەشتانەی فاسکۆ داجاما و ماجەلان پێی هەڵسان کە گەشتی ئاشکراکردن و دۆزینەوە بوو بۆ وەدەرخستنی خاڵی لاواز،کە دەکرا لە ڕێگەیەوە پێی بچنە نێو جیهانی ئیسلامی وەکو ڕێ خۆش کردنێك بۆ داگیر کردن و دەست بەسەراگرتنی ،بەڵام بەهۆی بوونی دەوڵەتی عوسمانی و هێزە ترسناکەکەی لە ڕۆژهەڵات وای لە هێرشەکانی خاچ پەرستان کرد بە ناچاری بە ئاڕاستەیەکی جیاواز دا بڕوات ،بۆیە

(1) ئیسپانیا لە ساڵی ( 1992ز) ئاهەنگی گێڕا بە بۆنەی تێپەڕبوونی پێنج سەد ساڵ بەسەر وەدەرنانی موسولمانەکان لە ئەندەلوس ، جابەبۆنەی ئەم یادەوەرییە شاری( مەدرید) تەرخان کرا وەکو شوێنێك بۆ دانوستان لە نێوان عەرەب و جوولەکە لە دۆزی فەلەستین..واتە دووبارە وەدەرنانی موسوڵمانان لە ئەندەلوس! عەرەبەکانیش ڕازی بوون!

هێرشە نوێیەکە دەبووایە بخولێتەوە لە چوارچێوەی ئەفریقیا بۆ ئەوەی بتوانێ داگیری لایە دوورەکانی بکات پێش ئەوەی بگاتە دڵی جیهانی ئیسلامی، بەتایبەتی بۆبیت المقدس ،کە هێرشی یەکەمی خاچ پەرستان – لەوێوە ڕووخا ،بەڵام لەم جارەدا بیت المقدس بە تەنها ئامانجی نەصرانیەکان نەبوو ،بەڵکو جوولەکەش بەشداری کردن ،بەڵام لە حیسابی تایبەتی خۆیان!

هەردوو سەدەی دوانزەهەمین و سیانزەهەمینی کۆچی(هەژدەهەمین و نۆزدەهەمینی زایینی) خەستییەکی چڕیان بەخۆوە بینی لە هێرشی خاچ پەرستەکان ،کە ئەم هێرشانە کۆتایی پێهات بەدەست بەسەراگرتنی زۆربەی شوێنەکانی جیهانی ئیسلامی پاش چەند جەنگێکی توندو بەهێز لە نێوان موسوڵمانەکان و خاچ پەرستەکان ڕوویدا ،کە کۆتاییەکەی هەموو بەشکان و دۆڕاندنی موسوڵمانان تەواوبوو بەرامبەر بەو داگیرکارییە ڕاماڵەو سەردانواندنی جیهانی ئیسلامی بۆ داگیرکاری نەصرانیەکان.هەرچۆنێك بێت ئەو تێك شکانە و دۆڕاندنە هەر لە خۆیەوە ڕووی نەدا بەڵکو چەند هۆکارێکی هەبوو.

لە هۆکارە دیارو ئاشکراکان ئەو پاش کەوتنە بوو،کە چوار دەوری موسوڵمانانی دابوو لە گۆڕەپانی زانست و گۆڕەپانی تەکنەلۆژیاو گۆڕەپانی ئابووریو گۆڕەپانی مەشقی سەربازی و خۆ پڕ چەك کردن.ئەم هۆکارانە هەمووی بووە هۆی دۆڕاندنی سەربازی بەرامبەر بە ڕۆژئاوا, کە توانی پێش بکەوێت لە هەموو ئەو گۆڕەپانانەی کە موسوڵمانان تیایدا دواکەوتبوون!جەنگی ئیمبابەی بەناوبانگ لە نێوان مەمالیکەکان و ناپلیۆن نموونەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ ئەم ڕاستییە ، کە ئەم جەنگە بە هەمووی بیست خولەکی خایاند! وەنەبێ مەمالیکەکان لە ئازایەتی جەنگی و بەرپەچ دانەوەی دوژمنەکەیان کەم بێت بەڵکو تۆپە پاشکەوتووەکانیان پاش هەر هاویشتنێك پێویستی بە ماوەیەکی زۆر هەبوو

بۆ ئەوەی سارد بێتەوە ئەوجا جارێکی تر سەر لە نوێ پڕ باروت بکرێتەوە،کە هەرکاتێك گەرم بووایە دوورییەکەی کەم دەبۆوە ،ئەوا بە هیچ شێوەیەك خۆی ڕانەگرت بەرامبەر ئەو تۆپانەی ،کە فیشەکەکانی لەسەریەك دەهاوێشتو زۆر بەهێزو خێرا تربوو دەگەیشتە شوێنێکی دوورتر لە تۆپی مەمالیکەکان.

بەڵام لێکۆڵینەوەی ژیرانە بۆ ئەم ماوەیە لە مێژوو پێویستە تەنها نەوەستێتە سەر هۆکارە دیارەکان بەوەی ڕاستییە شاراوەکانی پشت ئەو هۆکارانەی لە کیس بچێت.بەڵکو پێویستە قووڵ ببێتەوە بۆ ئەوەی هۆکارە ڕاستیەکان ببینیٚ کە وایکرد داڕمان و دۆڕاندن ڕوو بدەن.

کاتێك مێژوونووسی موسوڵمان هەڵدەستیٚ بە لێکۆڵینەوەی ئەو ماوەیە لە مێژوودا ئەوا پێویستە لەسەری هەڵوێستێکی جیاوازی هەبێت لە مەڕ مێژوونووسانی ڕۆژئاوا ئەمەش بە لایەنی کەم لەبەر دوو هۆکار.

یەکەم: مێژوونووسی موسوڵمان بەدوای ئەو ڕۆحە خاچ پەرستییەدا دەگەڕێت ,کە پاڵنەر بوو بۆ داگیرکردنی جیهانی ئیسلامی بەڵام دەبینی مێژوونووسی ڕۆژئاوا بە ئەنقەست دەیشارێتەوە سەرەڕای ڕوون و ئاشکرایی.ڕۆژئاوا بەردەوام وا حاڵی دەکردین ،کە داگیرکردنی بەو دواییەی بۆ جیهانی ئیسلامی هیچ پەیوەندییەکی نەبووە بە روحی خاچ پەرستی وەکو هێرشە کۆنەکانی خاچ پەرستان بەڵکو لەبەر چەند هۆکارێکی ئابووری ڕووت بووە ! کە جارێکیان گەڕان بووە بەدوای بەهاراتەکان و! جارێکیشیان گەڕان بووە بە دوای کەرەستە خاوە هەرزانەکان! جارێکیشیان گەڕان بووە بەدوای چەند بازاڕێك بۆ فرۆشتنی ئەو بەرهەمانەی ،کە ڕۆژئاوا لە لایەن خۆی دروستی دەکرد! لەگەڵ ئەوەی کە – فاسکۆ داجاما– پێشەوای یەکەم بۆ داگیرکاری نویٚ کاتێك گەیشتە دوورگەکانی هیندی ڕۆژهەڵات– بە یارمەتی نەخشەی ئیسلامی و یارمەتی دانی

دەریاوانی موسوڵمان ابن ماجد بە دەربڕینێکی زۆر ڕوون و ئاشكرا وتی : ئێستا گەردەن بەندی ئیسلاممان گرتووە تەنها ئەوە ماوە پەتەكە ڕابكێشین و بخنكێ!! ماجەلانیش یەكێكی ترە لە دێدەوانە یەكەمەكانی ئەو داگیركارییە ,كە زۆری لە پاپا كرد مۆڵەتی بدات بۆ ئەوەی سەركردایەتی هەڵمەتێكی خاچ پەرستانە بكات بۆ ئامانجێكی دیاریكراو ئەویش گێرانەوەی زەوییەكانی فلیپین لەژێر ئالآی خاچ پەرستان جا كاتێك پاپا بە گومان و دوودڵیەوە مۆڵەتی دا- چونكە متمانەی پێنەبوو ئەو هەڵمەتەی سەربگرێ- چووە ناو فلیپین و ئالآی خاچ پەرستی لەسەر یەكێك لە دوورگەكانی چەقاند،بەڵام موسوڵمانان كوشتیان و كۆتاییان بە هەڵمەتەكەی هێنا[1] !

بە ڕاستی ڕۆژئاوا لە هەڵمەتە نوێیەكەیدا بەرژەوندییەكی ئاشكرای هەبووە لە شاردنەوەی روحی خاچ پەرستیەتی بۆ خۆ پاراستنی لە وروژاندنی روحی ئایینی لەلایەن موسوڵمانەكان ، كە جیهادی پیرۆزییان لەلا زیندوو دەكاتەوە،ئەم جیهادە داگیركارەكان لە هەموو شتێك زیاتر لێی دەترسن-جا چ خاچ پەرست بوون یان سەهیۆنی یان چێڵ پەرست یان بت پەرست- كە ئەم جیهادە دەردێكی خراپی دایە داگیركارەكان لە هیندو جەزائیرو چەند شوێنێكی تری زەوی.

باوەڕ پێكراوی بەریتانی كرۆمەر لە یەكەم ڕۆژی داگیركردنی میسردا لە یەكێك لە یاداشتەكانی بەناوی میسری نوێخواز Modern Egypt نووسیویەتی: ئەركی پیاوی سپی كە چاودێری خودای ! لەسەر ئەم وڵاتەی داناوە بریتییە لە

---

(1) لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە منالەكانی خۆمان وا فێر دەكەین،كە ئەو گەشتانە گەشتی دۆزینەوە زانستییەكان بووە! دوایی دەڵێینە منالەكانمان ،كە وەحشیەكان ڕێزی ئەو ڕوحە زانستیەیان نەگرت كە ماجەلان پێی هەڵسا بۆیە كوشتیان!!

چەسپاندنی کۆمەڵگەکانی شارستانیەتی مەسیحی تا دوا ڕاددەی ڕەخساو، بە شێوەیەك، کە ببێتە بنچینەی پەیوەندییەکان لە نێو خەڵکی ،ئەگەرچی دەبی ئەرکیشی ئەوەبیٚ– بۆ خۆ دوورگرتن لە گومانان–کەوا کار بۆ گاورکردنی موسوڵمانان نەکاو،لە پۆستە فەرمییەکەی خۆیەوە چاودێری دیاردە ساختەکانی ئایینی ئیسلامی بکا وەك ئاهەنگە ئاینییەکان و شتی هاوشێوە !

ئامانجی ئەو قسەیە زۆر ڕوون و ئاشکرایە..دوورخستنەوەی موسوڵمانانە لە ئاینەکەیان بەبیٚ ئەوەی هەست بکەن،کە ئامانج لەوەدا دوورخستنەوەیانە لە ئیسلام! ئەمەش بۆ ئەوەیە ،کە ڕێگە بگیرێت لە دوودڵی و گومان..واتە بەربەستێك دروست ببێت لە وروژاندنی روحی ئاینی لەلایەن موسوڵمانەکان کاتێك ،کە رۆحی خاچ پەرستی لەسەر شێوەو ڕاستییەکەی خۆی دەردەکەویٚ!

نەفی و ڕەتکردنەوەی پاڵنەری خاچ پەرستی لە داگیرکاری نوێی خاچ پەرستان ئامانج گربوو بۆ خودی ئەو مەبەستەی کە کرۆمەر گەلآڵەی کرد ئەویش نەوروژاندنی رۆحی جیهادی پیرۆز دژی داگیرکارەکانو هەوڵدان بۆ ڕاهێنانیان بە جۆرێك ،قەبووڵی ئەمری واقیع بکەن هەتا ئەگەر بەرگریشیان کرد ئەوا بەبیٚ رۆحی جیهادی پیرۆز بەرگری بکەن ،کە داگیرکارەکان زۆر لێی دەتۆقن و دەترسن!

بۆ برەودان بەم درۆو دەلەسەیە لە دەروونی موسوڵمانەکان لە نێو وڵاتی داگیرکراودا ڕۆژئاوا وتی ،کە ئەو دەمێکە ئاینی فڕێداوەو! ئایین نەبۆتە پاڵنەر بۆ جمو جۆل کردنی! بەڵکو ئەوەی پالّی پێوە دەنیٚ بە تەنها بەرژەوەندی ئابوورییە !

لە ماوەی سەرگەردانیدا موسوڵمانان زمانیان لاڵ بوو لە مەڕ ئەم درۆو دەلەسەیەو بانگخوازی داگیرکاری فیکریش برەویان بەم درۆیەدا – جا بە

تێگەیشتنەوە ببێت یان بەبێ تێگەیشتن – بۆ ئەوەی هەموو حەرەکەیەکی جیهادی ئیسلامی سارد بکەنەوە دژی داگیرکەرەکان!

بەڵێ! ئەوروپا ئاینەکەی خۆی فرێداو، لە نێو وڵاتی خۆی جمو جۆڵو کاری پێنەدەکرد..بەڵام هەرگیز لە دەمارو رێگەکەی ئەو روحە خاچ پەرستیە شاراوەی لە بیر نەکردووە ،کە بەردەوام دژی ئیسلام و موسوڵمانان دەیجولێنێ! جا ئەو ڕاستییە ڕاستی فرێدانی ئەوروپا بۆ ئاینەکەی و مانەوەی ڕق وقینی خاچ پەرستی بەرامبەر بە ئیسلام ،کە سەرەڕای ئەوە هەر داگیرساو بووە – ئەوا ڕۆژهەڵاتناسی نەمساوی محمد أسد ئاماژەی پێکردووە لە پەڕتووکە بەناوبانگەکەی الاسلام على مفترق الطرق که داینـاوه پاش ئەوەی بووە بە موسوڵمان ،کە تیایدا هەوڵی داوە ڕاڤەی ئەو دیاردە نامۆیە بکات ،کە وتویەتی: هەرگیز وەکو ئەم دیاردەیە ڕووی نەداوە پاشان وتویەتی: بەڕاستی ئەو ڕق و قینە لە دەروونی ئەوروپیەکان هەر لە ماوەی هزرو شارستانیەتی منداڵییان لەگەڵیان لە دایك بووە،کاتێکیش گەیشتنە قۆناغی لاوی نەیان توانیوە لە دەروونیان بیسڕنەوە چونکە ئەوەی لە ماوەی منداڵیدا جێگیر دەبێتو دەچەسپێ ئەوا هەر لەدەروون دا دەمێنێتەوە(1)!!

ئێمە پێویستیمان بە دان پیانانی محمد أسدو ڕاڤە کردنەکەی نیە،چونکە بڕیارو دانپیانانی خوای گەورەمان لەلایە ﴿ ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى حتى تتبع ملتهم : ئەم جولەکەو فەلانە ،تانەچنەسەر دینی ئەوان خۆشیان لەتۆ نایە﴾ سورەتی بقرة:120.

---

(1) تەماشای کتابی الاسلام على مفترق الطرق بکە لە وەرگێرانی محمد فروخ لا 58-59

ئێمە قەسابخانەی بۆسنەو هێرسکمان لەلایە،کە شاهیدێکە هیچ لادانێك بە خۆیەوە هەڵناگرێ.

نوێنەری بەریتانیا ئوین لە بۆسنەو هێرسك هیچ بەرژەوەندییەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی نیە لەو هەرێمە بەڵام کاتێك قسە دەکات هەروەکو بلێی بە زمانی سربەکان قسە دەکات ، بەڵکو هەندێك جار چەند شتێك داوا دەکات بۆ سربەکان ،کە بە خۆیان ئەوەندە داوا ناکەن ، بەڵکو زیاتر لە جارێك داوای کردووە ،کە دەبێ موسوڵمانەکان سزا بدرێن چونکە ڕازی نەبووینە سربەکان بە وەحشی گەریانەو بەبێ دەنگی بیان کوژن و ئابڕوویان هەتك بکەن بەڵکو ئەوان کات نا کاتێك بەرگرییان لە خۆ کردووە ! !

دووەم: هۆکاری دووەم ,کە پێویستە مێژوونووسی موسوڵمان بەدەری بخات بەڵام مێژوونووسی ڕۆژئاوا بە هیچ شێوەیەك باسی ناکات ئەوەیە ،کە هۆکاری ڕاستەقینە لە پشت ئەو هەموو جۆرە پاش کەوتنەی گەمارۆی موسوڵمانانی دابوو لەم دواییەدا ئەوا پاشکەوتنیان بوو لە لایەنی عەقیدەو پاشکەوتنیان بوو لە ڕاستی لا اله الا الله .بەڕاستی لاوازی و بێهێزی هەرگیز لە سروشتی ئەم ئایینە نییە ،بەڵکو ئاینی هێزو جیهادو قایم بوونە،کە توانی لە ماوەی چەند ساڵێکدا هەموو ئیمپراتۆریەتی فارسی ڕامالێ و نیوەی ئیپراتۆریەتی ڕۆمانیشی ڕامالی ،ئەو ئاینەی تەتاریان لەسەرەتای لافو گەزافیاندا تێك شکاندو توانی خاچ پەرستەکانیش تێك بشکێنێ لە هێرشە کۆنەکانیان وتوانی لەزۆربەی زەوی ئاوەدان کراودا جێگیرو بەهێز بێت ،کە لەو کاتی بەرقەراربوون و جێگیری و گەشە سەندن هەبوو. بەڵکو بێهێزی و لاوازی لە ژیانی موسوڵمانان توخمێکی لە ناکاو بووەو تووشیان نایەت کاتێك بە تەواوی دەست دەگرن بە ئاینەکەیان.جا ئەو بێهێزی و لاوازییە ئەگەر هۆکارەکەی ئەو خۆش ڕابواردنە بووبێت ،کە تووشی

فەرمان ڕەوایە عوسمانییەکان هات پاش ئەوەی ڕێگەیان بۆ ئاسان بوو بۆ وەدەست هێنانی سامان و زاڵ بوون بەسەر دوژمنەکانی دا ، یان بازنەی زیکری سۆفیەکان بوو ،کە هەموو وزەی موسوڵمان لە خۆ دەگریٚ بۆ ئەوەی لای بدات لە جیهاد کردن و بیکاتە چەند پاکیگارێکی روحی ،کە زیاتر بە سست بوون دەچێت بەر لەوەی بە ئاگادارییەکی زیندوو بچێت ، یان بلاوبوونەوەی شتە پڕوپووچەکان و پەیوەست بوون بە شتە لە ئاسا بەدەرە گومان لێکراوەکان و کەراماتی شێخە مردوو زیندووەکان بوو ،یان فەرامۆشکردنی زانستە کەونییەکان و فەرامۆشکردنی ئاوەدانکردنەوەی زەوی ودەست لێبەردان لە هۆکارەکانی قایم بوون و جێگیربوون بوو ، یان گەلەکایی سیاسی بوو،کە وای لە خەڵکی دەکرد هەر بە خۆیان خەریك بن و واز لەو کارو بارانە بێنن ،کە بڕیار لەسەر چارەنووسی ئوممەت دەدات و ئایین لە هۆش و هەستیان تەنها بریتییە لە دروشمی پەرستنەکان ،یان ئایین هەموو لە کۆتاییدا ببێتە چەند نەریتێك لە خودی خۆیدا سەرپەرشتی بکریٚ بەلاٚم بەتاڵ بێت لە ڕوح..

جا ئەگەر هاتوو هەر یەکێك لەو هۆکاران بێت ئەوا هەمووی لە سروشتی ئەم ئاینە نییەو لە دەقەکانیشی وەرنەگیراوەو لە مێژووشی دا شتی وای بە خۆوە نەبینیوە کاتێك بە شێوەیەکی ڕاست و دروست لە واقیعی ژیان جێبەجێدەکرا.

مێژوونووسی وردکاری ئەوروپی زانینی ئەو ڕاستییەی لە کیس ناچیٚ ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ﴿١٤٦﴾ ﴾ البقرة: ١٤٦.

بەلاٚم ئەگەر بشیزانیٚ و دڵنیاش بێت لێی ئەوا قەت ئاشکرای ناکات ﴿ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾دەسەیەکیشیان هەرچەندە دەزانن هەق چییە دەیشارنەوە. ئەگەربێت و ئاشکرای بکات ئەوا وەکو ئەوەیە موسوڵمانان

وریا بکاتەوە بۆ ڕاستی لاڕێ بوونیان لە سەرچاوەی هێزی ڕاستەقینەیان و بانگەشەیان دەکات بۆ گۆڕینی واقیعەکەیان و گەڕانەوە بۆ هەقیقەتی ئیسلام ،کە ڕۆژئاوا بە قەد هیچ شتێك ڕق و قینی نییە ئەوەندەی بەرامبەر ئەوەی هەیەو ، لە هیچ شتێکیش ئەوەندە ناترسێ بە قەد ئەوەی لەوە دەترسێ.

مێژوونووسی ئەوروپی و– ئەوەی لە موسوڵمانانیش دوایان کەوتن ،کە نقووم بوو بوون لە نێو سەرگەردانی – بە ئەنقەست شتێکی تریان کرد،کە زۆر خراپتر بوو لە شاردنەوی ئەو ڕاستییە ، ئەویش گومانیان برد ،کە ئایین هۆکاری هەموو دەردو بەڵاو نەهامەتییەکانە ! لە بێهێزی و پاش کەوتن و شتی پڕوپووچ و نەفامی و سووکی و تەمبەڵی! کەواتە هەر دەبێ ئەو ئایینە فڕێ بدرێ بۆ ئەوەی خەڵکی ڕزگاریان بێت لە نەفامی و پڕوپووچی‌و، کۆت و زنجیرەکانیش لا ببردرێن ،کە ڕێگە دەگرێت لە ڕاپەڕینیان ! پاشان ئەوروپا سوور بوو– لەگەڵیشی سووربوون–لە ڕێگەگرتنی هەر نیشانەیەك بیەوێ خەڵك ئاگادار بکاتەوە لە هەقیقەتی دووریان لە ڕاستی و دروستی ئایین ،بەڵام خۆ ئایینی هەقیقی شتێکی ترەو جیاوازە لەو ئاینەی ئەمڕۆ بەناوی ئیسلامەوە مومارەسە دەکرێ.

جارێکیان هاوەڵێکم لە سەرەتای ساڵی شەستەکان لەم سەدە زایینییە بۆی گێڕامەوە،کە پێکەوە کارمان دەکرد لە بەڕێوەبەرایەتییەك[1] چاوی کەوت بە ڕۆژهەڵاتناسێك ،کە دوایین ڕۆژی بوو لە قاهیرە ،جا پرسیاری لێکرد لە چەند شتێك ،کە پەیوەندی بە ئیسلام و موسولمانانەوە هەبوو هزرو بیریان لە چوارچێوەی ئەخولێتەوە،جا لەکاتی گفت و گۆیەکە پرسیاری لێکرد ئایا فلانەکەس دەناسی؟(کەناوی منی هێنا ) وەڵامی دایەوە بەڵێ دەیناسم. پرسیاری

(1) بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری گشتی لەوەزارەتی خوێندنی باڵا لە قاهیرە.

لێکرد: ئایا لەدەرچووی زانکۆی ئەزهەرە ؟وتی:نەخێر ! بەڵکو دەرچووی کۆلێژی بەشی زمانی ئینگلیزیە لە زانکۆی قاهیرە ! جاواق ورمانی خۆی و وەرسی خۆی نەشاردەوە ،کە یەکێك دەرچووی ئەم بەشە بێت کە لەبنچینەدا بۆ دەرچواندنی عەلمانیەکان دامەزراوە،کە لە بیرو بۆچوون و بیرکردنەوەیان بەدوای ڕێبازی رۆژئاوا دەکەون لەژیاندا – سەرای ئەوە خۆی سەر قاڵ بکا – بەچەند کاروبارێکی ئیسلامی و نووسینی چەند بابەتێکی ئایینی !

پاشان ئەم رۆژ هەڵاتناسە هەڵسا بە ڕەخنەگرتن لە نووسینەکانم بەتایبەتی پەرتووکی شبهات حول الاسلام [1] ئەوەی کە زۆر وەڕس و بێزاری کردبوو شتێك بوو ئەویش من ڕەخنە لە ماددیەتی رۆژ ئاوا دەگرم و،هێرش دەبەمە سەر ئەو شارستانیە ماددیەی ،کە بەتاڵ کراوە لە روح .جا زۆر بەتورەییەوە وتیە هاوڵەکەم : ئێوە بەروحانیەتەکەتان چیتان کردوە ؟! ئەگەر پێشکەوتنی ماددی ئێمە نەبوایە ئێوە نەتان دەتونی بژین ! هاوەڵەکەم –رەحمەتی خوای لێبێ–پێی وت : من دەلێم ئیسلام تەنها ڕوحانیەت نیە ،بەڵکوجیهانی ماددەو جیهانی ڕوح پێکەوە کۆدەکاتەوەو،لەیەك کاتیشدا بانگەشەدەکات بۆسەرفکردنی وزەو توانا بۆهەردوبوارەکان .وتیەهاوەڵەکەم .بەلام واقیعەکەتان پێچەوانەی ئەوەیە ! هاوەڵەکەم ،کەلەباتی منەوە دەدوا وتی ئەودەڵێ واقیعی ئەمرۆی موسوڵمانان زۆردوورە لەهەقیقەتی ئیسلام ! دەڵێ تەکانێکی دا لەسەرکورسیەکەیو

---

(1) ئەم کتابە رۆژهەلات ناسەکانی زۆر وەڕس و بێزارو تورەکرد ، چونکە بەر پەرچی ئەو گومانانە دەداتەوە ، کە لە رێگایدا ویستیان خەڵکی لە دەست پێوە گرتنیان بە ئیسلام لابدەن ، چونکە ئەو کتابە شتە بەدو نەگریسەکانی ئەم شاریستانیە تە رۆژئاوایە بۆ خەڵکی ئاشکرادەکات ، کەئەم رۆژهەلات ناسانە بانگەشەی بۆ دەکەن لەباتی ئیسلام.

بەتوڕەییەوە وتی .ئەو ئەوهادەڵێ ؟! لەکوێ ئەوقسەیەدەکات ؟! منیش وتم لەکیتابێکی دا بەناوی هل نحن مسلمون جارۆژهەڵات ناســـەکە بەتوڕەییەوە وتی .بەڕاستی ئەمە شتێکی مەترسی دارە !!

شتێکی مەترسی دارە،خەڵکی وریاببنەوە یان وریابکرێنەوە – لەوەی هەقیقەتی ئیسلام ئەوەنیە ،کەئەمڕۆ بەناوی دین مومارەسەدەکرێ و، ئەو واقیعە دژواروخراپەی ،کەموسوڵمانان ئەمڕۆ لەژیانی خۆیان بەسەری دەبەن هۆکارەکەی دوور کەوتنەوەیانە لەهەقیقەتی ئیسلام. مێژوونووسی موسوڵمان – کاتێك مێژووی ئەوماوەیە دەتوێژێتەوە – لەئیسلامەکەی پێویستیەکی لەسەر شانە دەبێ جێ بەجێ ی بکات ،ئەویش هۆکاری هەقیقی دۆڕانی سەربازی بەرامبەر بەرۆژئاوا بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە ،بەهەمان شێوەش ئەوەشیان بۆ ڕوون بکاتەوە ،کە هۆکاری دۆڕانی رۆحی چی بوو، کە لەدوای ئەو دۆرانە هات ،کە لەگۆرەپانی جەنگ دا رووی دا. .

سەبارەت بە دۆرانی جەنگی ئەنجامەکەی ئەوەبوو،کەدەست هەڵگیرا لەو هۆیانەی ،کە هێزوو وزەی لێدەهاتەدی ،بەڵام خودی وازلێهێنانی هۆیەکان سەریکێشا بۆ کەم و کوڕی لەلایەنی عەقیدە،کەتووشی موسوڵمانان هات و وای لێکردن لاڕێ ببن لەلە هەقیقەتی ئایین وکردەوە نەکەن بە داخوازیەکانی .

فیکری ئیرجائی ،کە کردەوەی لەبازنەی باوەڕ دەردەهێناو باوەڕی تەنها دەکردە بەڕاست زانینی دڵ و دان پیانان بە زوبان ،ئەو فیکرە لاڕێ بوون بووپەیوەندی بە عەقیدە وە هەبوو، جیاواز بوو لە ڕێبازی سەلەفی سالح ئەوانەی فەرمویان باوەڕبریتیە لە وتەو کردار، ئەوانەی لەبیروبۆچوونیان وابوو ، کە زانستێك کردەوەی لەگەڵدانەبێ ئەوا زانستێکی ڕاست و دورست نیە و،کردەوەش بەروبومی زانستە .

جابەڕاستی ئەو لاڕێبوونە عەقیدەییە وای کرد خەڵکی بەشێوەیەکی خوارو خێچ و ناڕاست لە ئایین حاڵی ببن‌و بەهەڵس و کەوتێکی خراپ مامەلە لەگەڵ ئایین بکەن ،خەڵکی لە ئەرکەکان زیاتر ڕایانکرد کرد بێ ئەوەی هەست بەهیچ جۆرە شەرمەزاریەك بکەن ،چونکە ئەوان – لەدەروونەوە وا گومانیان دەبرد– کە باوەڕدارێکی ڕاست ودورستن ئەگەر چیش با ڕابکەن لەو ئەرکانە مادام بەدڵ ئایین بەڕاست دەزانن‌و بەزمانیش دانی پیا دەنێن!

فیکری سۆفیش ،کە شێخی قەبەو گەورە دەکرد لەهۆش و هەستی مورید تا وای لێهات بووە پێناوێك لەنێوان بەندەو خوا ،ئەو فیکرەش لاڕێ بوون بووپەیوەندی بە عەقیدەوە هەبوو جیاوازیش بوو لە ڕێبازی سەلەفی سالح ،ئەوانەی لە پەرتووکی خواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم فێرببوون کە هیچ پێناوێك لە نێوان بەندە و خودادانیە تەنها کردەوەی باشە نەبێت ، کە خوا رازی دەکاو خواش لەخاوەنەکەی رازی دەبێ و،گەورەترین کردەوەش ،کە لەخوات نزیك دەکاتەوە جیهادکردنە لەپێناوی خواوفەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپەیە و هەوڵ و کۆشش کردنە بۆ ڕاست کردنەوەی کۆمەڵگا کاتیك لە ڕێگا لاڕێ دەبن . .

جالەلایەك ئەنجامی ئەو لاڕێبوونە ئەوە بوو ،کە جۆرەها شیرك بێتە ناو پەرستنەکان ،لەلایەکی تریش خۆبەستنەوە وهەڵواسین بوو بەشتە پروپووچ و گومان لێکراوەکان و واز لێهێنانی ئەو کردەوە ئیجابیانە بوو ،کە خوا گۆڕان کاری لەزەوی دا پێدەکات بەگوێرەی سوننەتە کەونیەکانی ،بەڵکوئەو فیکرە چاوەڕێی شتێکی لەئاسا بەدەر دەکات ،کە لەسەر دەستی وەلیەك لە وەلیەکانی خوا دێتە دی وگیروگرفتەکان بەبێ مانووبوون وخۆ سەرقاڵ کردن چارەسەر دەکا ! .

باوەڕبوونی شێواو بەعەقیدەی قەزاو قەدەر،کە بەرپرسیاریەت هەڵدەگرێ لەسەر مرۆڤ کاتێك کردەوەیەك یان هەڵەیەك دەکات بەبیانووی ئەوەی تووشی دەبێ قەزاو قەدەر وبڕایتەوە و هیچی لەبەرامبەر پێناکرێ ،کە ئەم جۆرە عەقیدەیە شێواوە وادەکات خۆ بە دەستەوەدانێکی سەلبیانە ئەنجام بدرێت لەهەموو ئەو شتانەی ڕوودەدەن‌و ،وا دەکا هەوڵ نەدرێت بۆ گۆڕانکاری بەبەهانەی ئەوەی هەڵسان بە گۆڕانکاری وەکو ئەوە وایە هەڵبگەڕێیەوە لەسەر قەزاو قەدەری خواو پێی ڕازی نەبیت،هەروەها ئەو جۆرە عەقیدەیە بانگەشە دەکات بۆ وەگەر نەخستنی هۆیەکان عدم الاخذ بالاسباب بەهەنجەتی ئەوەی ئەمە باوەڕ کەم دەکاتەوە و بەڵگەیە لەسەر پشت نەبەستن بەخوا. ئا ئەمانە هەمووی لاڕێ بوون بوو و پەیوەندی بەعەقیدەوە هەبوو جیاواز بوو لەڕێبازی سەلەفی سالح،کەباشترین و چاکترین خەڵك بوون لە باوەڕبوون بە قەزاو قەدەری خوا، ئەوان لەکیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی– دروودی خوای لەسەربێ – دەیانزانی کەباوەڕبوون بەقەزاو قەدەری خوا بەرپرسیاریەت لەسەر مرۆڤ هەڵناگرێ کاتێك هەڵەیەك دەکات لەکردەوەیەك یان کەمتەرخەمی لەئاستدادەکات و ڕێگریش نیە بۆهەوڵدانی گۆڕینی و چوون بەرەو قەزاو قەدەرێکی نوێ لەلایەن خوا, هەروا پشت بەستنی تەواویش ڕێگر نیە لەبەکارهێنانی هۆیەکان .حەتمیەتی هاتنەدی قەدەری خواو ویست ومەبەستەکەی بەهەمان شێوە ڕێگر نیە لەبەکارهێنانی هۆیەکان.

بۆیە لەڕووداوی ئوحد خوای گەورەیە فەرمویە موسوڵمانان ئەو دۆرانەی کەتووشتان هات هۆکارەکەی خەتای خۆتان بوو چونکە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەرەکەتان کرد– صلى الله عليه وسلم _لەهەمان کاتیشدا دەبینی ئەم ڕووداوە قەزاو قەدەرە ﴿ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ

مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٦٥﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴿١٦٦﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٥ - ١٦٦ (..ئاخۆکاتێك زیانوو لەدووژمن پێگەیشت_کەجارێکیش دووئەوە ندە و زیان لێدان هیچ پرسیتان زیانەکەمان لەچی بوو؟بێژە )): لەخۆتانەوە بووخوا بۆ هەموو شت توانایە.هەرچی ئەو ڕۆژە تووشو هات وادووکۆمەڵ بەیەك گەیین گشتی بەئیزنی خودابوو کاتێك ئەم دۆرانە ڕوویدا پێغەمبەر – صلی الله علیه وسلم– لەمەڕگۆڕینی ئەم ڕووداوو هەڵۆێستە دانەنیشت بەڵکو مسوڵمانانی هاندا ئەگەر چی بریندارو شەکەتو ماندووش بوون بۆڕووبەڕووبونەوەی دوژمن، جا دوژمن بەفەزڵی خوا بەبێ شەرکردن پاشەکشەیان کرد ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٧٢ - ١٧٤: ئەو کەسانەی کەلەپاش بریندارbوونیبش فەرمانی خواو پێغەمبەریان بەجێهێنا ،بۆ ئەوانیانە واکاری چاکیان کردو لەخواترسان ،پاداشتێکی گەورە هەیە. ئەو کەسانەی پێیان ووتن: گەلە کۆمەکیو لێکراوە بەپانەوە دێنە سەرتان ئەشێ ترس و لێان هەبێ، باوەڕیان بەهێزتربوو گوتیان: ئێمە هەر خودامان بێ بەسمانە و چاکترین پشت و پەنامان تەنیا ئەوە.هاوڕێ دەگەڵ نیعمەت و چاکەی خودادا__ بێ ئەوەی توشی زیان بن __ گەڕانەوە و هەڵوەدای ڕەزای خودابوون هەرخوداشە چاکەی گرنگی لەدەستە.

جاپێغەمبەر– درودی خوای لەسەر بێ– لەپەروەرگار لێدوانێکی وەرگرت بۆخۆیو ئومەتەکەی ،کە کەل و پەلەکانی جەنگ ئامادەبکەن وپاشان پشت

بەخواش ببەستن ﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران: ١٥٩ وەختێ لێبڕا کاری بکەی هەربەتەمای خوا تێکەوە .

عەزیمەتیش خۆئامادەکردنی گەرەکە ئەگینا تەنها ئومێدیکە و هیچ شتێك ناگۆڕێ لە واقیعدا.

خودای باڵادەست بڕیاری داوە لەسەرئەوانەی کافرن کەنەپێشی دەکەون و نەدەستەوەسانی دەکەن.قەدەری خواش بۆجێگیرکردنو قایمکردنی ئەم دینە لەزەویدا شتێکە کە تێپەڕبوەو بەجێهێنراوە.بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەخودی دەقی ئایەتەکە فەرمانی بەمسوڵمانان کردوە کە خۆئامادەبکەن و هۆکارەکان بەکاربهێنن ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْ إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ ﴿٥٩﴾ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾ الأنفال: ٥٩ - ٦٠: خودا نەناسان وابیر نەبەن وەپێش کەوتوون ئەوان ئێمە نابەزێنن.تابۆ دەکرێ چەك و جبەخانەی شەڕو ئەسپی سواری پەیدابکەن دوژمنی پێ بترسێنن کەدوژمنانی خوداشن. غەیری وانیش دوژمنو هەن نایان ناسن بەڵام خودا دەیان ناسێ .هەر ماڵێ لە لەراهی خودای بەخت بکەن خودا دەیبژێرێتەوەو هیچ ناهەقی لێناکرێ.

ئەو کەم و کوڕیەی کەوتە ناو عەقیدەی قەزاو قەدەر وای کرد پشـت بەستنێکی سەلبی ئەنجام بدرێت لەباتی پشت بەستنێکی بەڕاستو دروسـتیو وای کرد هۆکارەکان فەرامۆش بکرێت لەبەکارهێناندا ،کەلەنێویدا هۆکارەکانی هێزو وزەهەیە کەخوای گەورە فەرمانی کردوە ئامادەبکرێ بـۆ ترساندنی دوژمنو

وایکرد هەژاریو نەخۆشیو بێ دەسەلاَتی بلاَوببێتەوە لەهەمـان کاتیشدا دابنیشن لەمەر هەولَدان بۆگۆرینی .

ئەو بـیرو بۆچوونە شێواو تێکچووەی ڕوویدا لە پەیوەندی نێوان دونیاو ئاخیرەت و لەنێوان کردەوە بۆ دونیاو کردەوە بۆ ئاخیرەت ،ئەمەش لارێ بوون بوو پەیوەندی بە حەقیقەتی ئەم دیـنەوە هەبوو ،لارێ بوون بوو لەڕێبـازی سەلەفی صالَح ئەوانەی لە کیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکـەی تێگەیشتبوون کە دونیا کێلَگەی ئاخیرەتەو ،ئاوەدان کردنەوەی زەویش بە گوێـرەی ڕێبازی خوا بەشێکە لەو پەرستنەی لە مرۆڤ داوا کراوەو کردەوەش بۆ ئاخیرەت مانای ڕەت کردنەوەی هەولَدان و کۆشش کردن نییە بۆ دونیا:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ﴾ الملك: ١٥ ئەوە کە ئەو زەمینەی کەوی کردوون ،شانەوشان تێیدا بگەڕێن و لە بژێوەکەی بخۆن هەستانەوەش بۆ لای ئەوە

﴿ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾

القصص: ٧٧ بەوەی خودا بەتۆی داوە بەشوێن مالی سەلاَوەبە! بەشی خۆشت لەم دونیایە لە بیرمەکە ! وەك خوا چاکەی دەگەل ْکردووی چاکەی بکەو لەم عەرزەش دا مەکەوە شوێن بەدفەڕی خوا بەدفەڕی خۆش ناوێن.

پێغەمبەر– دروودی خوای لەسەر بێ– قەدەغەی ئەو کەسانەی کرد کە گومانیان وابوو تەنیا کردەوە بۆ ئاخیرەت دەکەن بەوەی هەموو ڕۆژووبەبێ شکاندن دەبن و شەو هەموو زیندوو دەکەنەوەو ناخەونو دووریش دەکەونەوە لە ژنو ژن خوازی .پێغەمبەر– دروودی خوای لەسەر بێ– پێی فەرموون ( انی

اعبدكم لله واخشاكم له ولكنى اصوم و افطر واقوم وانام و اتزوج النساء فمن رغب عن سنتى فليس مني[1]: من لە هەمووتان بەندەترو لە خواترس ترم ، بەڵام بە ڕۆژو دەبم و فتاریش دەکەمەوەو، شەو نوێژ دەکەم‌و دەخەوم‌و ،ژنیش دەهێنم، ئەوەی لە سوننەتی منیش لابدا لە من نییە)

ئەو لاڕێ بوونەی لە داخوازیەکانی لا اله الا اللّه ڕوویدا بووە هۆی فەرامۆش کردنی زانیاری لە زانستی پزیشکی و گەردوون و فیزیاو کیمیاو بیرکاری جوگرافیا جگە لەم زانستانە زانستی تریش چونکە ئەمانە پەیوەست بوون بە زەوی و ژیانی دونیاوە ، بۆیە موسوڵمانەکان بە پاشکەوتن لە هەموو گۆڕەپانەکان.

لێرەدا بەڕوونی دەردەکەوێ کە پاشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژی و ماددی هتد.. هۆکار بوو بۆ دۆڕاندنی سەربازی بەرامبەر بە ڕۆژئاوا ،ئەوەش بەڕاستی لەسەرەتا لەو پاشکەوتنە عەقیدەییە دەستی پێکرد، کە لەژیانی موسوڵمانانداا نەوە پاش نەوەیەك زیادی کردو خڕبۆوە سەر یەکتری هەتا عەقیدە ڕاستەکە نەدەتوانرا ببینرێ لەنێو تەپو تۆزداو ئەو بارگە زیندووەی لە ژیانی موسوڵمانان نەدەبەخشی .

بەڵام کارو بارەکە لەگەڵ مێژوونوسی موسوڵمان هەتا ئەو ڕادەیە کۆتایی پێ نایەت.

بەڵکو لێرەدا کارو بارێکی ترهەیە گرنگیەکەی کەمتر نییە لەویتریان‌و شاردنەوەکەشی کەمتر نیە لە بیرو هۆشی ئەو کەسانەی تێڕوانینیان کورت هەڵدەبرن لە هۆکارە دیارەکان و قووڵ نابنەوە لە هۆکارە ڕاستیەکانی پشتیەوە.

---

(1 ) اخرجهُ الشَيخان

دۆڕانی سەربازی ڕوویداو لە دوای دۆڕانی رۆحیش هات تووشی موسولمانان بوو ،کەیەکەم جارە لە مێژوویان تووشی دۆرانی رۆحی بێن.

لە زۆربەی کیتابەکان گوتومانە [1]، کەبەڕاستی دۆڕانی سەربازی بەتەنها ئەو کاریگەریەی لە دەروونی موسوڵمانەکان بەجێ نەدەهێشت بەوەی لەو جارەی دواییەدا کاری تێکرد کاتێك سوپای موسوڵمانان بەرامبەر ڕۆژئاوا تێك شکا.

لە ڕاستیدا موسڵمانەکان تووشی لە ناکاویەکی تیژ هاتن– پاش دۆڕانەکە– لەو جیاوازیە زۆرەی بەدیان کرد لە نێوان خۆیان و ئەو ڕۆژئاوایەی ، کە بەزاندوونی لە زانست وتەکنۆلۆژیا و لە پێشکەوتنی ماددی و شارستانی ..کە ئەمەیان شوێنەوارێکی زۆری هەبوو لەو دۆڕانە دەروونیەی تووشی موسوڵمانان بوو.

بەڵام بە تەنها دۆڕانی و سەربازی و ،زانینی موسوڵمانان بەو جیاوازیەی لەنێوان خۆیان و دوژمنەکەیان هەبوو لەهۆکارە ماددیەکان ،ئەم دووانە ئەم هەموو گۆڕانکاریو وەرچەرخانەیان دروست نەدەکرد لە ژیانی موسوڵمانان ،ئەگەر لە ژیانیان بەتاڵی ڕۆحی و عەقیدەیی نەبوایە پێش ڕوودانی بەرکەوتنیان .

لە پێشدا دۆڕانی سەربازی ڕوویدا بەڵام هیچ شتێکی لەبیرو بۆچوون و بیرو باوەڕو هەڵس و کەوتیان نەگۆڕی..

یەکەمین دۆڕان لە ڕۆژی ئوحد ڕوویدا جا خوای گەورە فەرمایشتی خۆی ناردە خوارێ ﴿ وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ ﴾ آل عمران: ١٣٩ (با سستی ڕووتان تێنەکاو خەمیش مەخۆن . هەر ئێوە کەسەردەکەون،ئەگەر بڕواو بە خوا هەیە) بەڕستی ئەوانە بڕواداری تەواو بوون

(1) بۆنمونە تەماشای کیتابی واقعنا المعاصر بکە

،کە لەم وانەیە تێگەیشتن و لەو دۆڕانەیان بە ئاگا هاتنەوەو ،زانیان،کە بە باوەڕەکەیان شکۆمەندو بەرزن بادۆڕانێکی کاتیش تووشیان بێ بەرامبەر دوژمنەکەیان ،بەڵام لە دوای ئەو ڕووداوە لە دوو ڕووبەڕوو بوونەوەی ترسناکدا هەرگیز تووشی بێ هێزی و چرووکی دەروونی نەهاتن ،کەجارێکیان لە نیوان خۆیان و تەتار ڕوویدا، جارەکەی تریشیان لە نێوان خۆیان و خاچ پەرستەکاندا ڕوویدا،کە دۆڕانی بەرامبەر تەتار زۆر تێك شکێنەر بوو..

تەتار بەغدایان داگیرکردو خیلافەتی عەبباسیان ڕووخاندو موسوڵمانانیان زەبوون و سووك کرد تا ڕادەیەك کە بڕوا ناکرێ, ئەم زەبوونی و سووکیە گەیشتبووە ئەو ئاستەی ، کە تەتەریەك لە ماڵی خۆی دەهاتە دەرێ و هیچ چەکی پێ نەبوو ،لە ڕێگادا تووشی موسوڵمانێك دەبوو ،پێی دەگووت: لێرەبە هەتا دەڕۆم شمشێرەکەم دەینەم بۆ ئەوەی بت کوژم ، جا موسوڵمانەکە سەری دادەنواندو مل کەچ دەبوو هەتا تەتەرەکە بە شمشێرەکەی دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی بیکوژێ..ئایا زەبوونی و سووکی لە پاش ئەم ڕووداوەدا هەیە !

بەڵام روحەکانین هەرگیز سوك و زەبوون نەبوو !

بەچاوێکی سەرسام و گەورەیی نەیانڕوانیە تەتارەکانو! بیروبۆچوونیان وانەبوو ،کەتەتارەکان لەوان باشترن بەوەی لەم ساتو کاتەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە ! بەڵکو لایان وابوو ، کەتەتار هێزێکی وەحشیگەری گەوجی دڕندەن ،یان پێش هەموو ئەمانەوە بت پەرستن‌و خودا ناناسن‌و دان بەدینی هەقدا دانانێن.

موسوڵمانان لە سەرەتادا بەرامبەر خاچ پەرستەکان تێك شکان‌و دۆڕان ،کە خاچ پەرستەکان توانیان چەند دەوڵەتێکی بچووك لە هەندێك شوێنی جیهانی ئیسلامی دابمەزرێنن ،کەچەند ماوەیەك بەردەوام بوو ،کە تیایدا خۆیان زاڵ کرد

بووە سەر موسوڵمانانو سوكو زەبوونیان دەكردن , بەڵام روحەكانیان هەرگیز سووك و زەبوون نەبوو.

بەچاوێكی سەرسامو گەورەیی نەیانڕوانیە خاچ پەرستەكان ! بیروباوەڕیان وانەبوو ,كە خاچ پەرستەكان لەوان باشترن بەهۆی ئەوەی لەم ساتو كاتەدا سەركەوتنیان بەدەست هێناوە ! بەڵكو لایان وابوو ، كە ئەوان موشریكن و خاچ دەپەرستن ، یان لە سەروی هەموو ئەوانە دەیان گووت : ئەوانە بێ ئابڕوونەو هیچ شەرەفیان نیە ئەمەش بە هۆی ئەو ڕەوشتە خراپانەی لەناویان بڵاو ببۆوەو غیرەتیان كز ببوو بەرامبەر ئابڕوویان..بۆیە لە بەرئەم شتانە بەكەم و سوكی دەهاتنە بەرچاویان.

پاشن سەركەوتن لەلای خوای گەورەوە هات كاتێك موسوڵمانەكان بە بیڕوباوڕە ڕاستەكەیان ڕوویان كردە خواو هۆكارەكانیان بە گەڕخستو ،هاواری وائیسلاما لە سەر زاری قوتزو ،شاڵاوە ڕاست گۆیەكەی لە سەر تەتاردا لە شەڕی عین جالوت گۆڕانكاریەكی زۆری لە لاپەڕەی مێژوودا كرد ، كە موسوڵمانەكان بە تەنها سەرنەكەوتن ، بەڵكو تەتاریش هاتنە ناو ئیسلام و بوون بە موسوڵمان پاش ئەوەی دوژمن بەرامبەر موسوڵمانان ، كۆششی سەلاحەددینیش لە چاكسازی عەقیدەی خەڵكی و وەگەرخستنی هۆیەكان بووە هۆی سەركەوتنێكی براوە،كە توانی بیت المقدس بسەنتەوەو ماوەی چەند سەدەیەكیش ڕێگەی لە خاچ پەرستەكان گرت لە داگیركردنی ڕۆژئاوای ئیسلامی ، پاشان شوێنەواری كاروبارەكە لە ناوچەكە پەڕیوە لەو كاتەی ئەوروپا بە یارمەتی و پشت بەستان

بە شارستانیەتی ئیسلامی ڕاپەڕینەکەی دەستی پێکرد پاش ئەوەی دۆڕان بەرامبەر بە موسوڵمانان..[1]

بەڵام ئەو جیاوازیە گەورەیە ساتێك چیە هەڵوەستەی بە موسوڵمانان نەکرد بۆ ئەوەی تێی بفکرن و بیری لێبکەنەوە بەڵکو لە هەست و دەروونیاندا هیچ نرخ و قورساییەکیان بۆ ئەم کارە دانەنا .

بڕوانە ڕەبعی کوڕی عامیر کە بە باوەڕێکی پتەو چووە لای روستم ،کە لەسەر بەڕو مافورە قەشەنگو گران بەهاکانو لەسەر جێگا شکۆو بەرزەکەی دانیشتبوو لەگەڵ ئەوەشدا سەیری ئەم هەموو شتانەی کرد بەچاوێکی سووكو، بە ئەنقەستیش گاڵتەو سووکایەتی لە پێشیاندا نیشاندوا بە سەری ڕمەکەشی مافورکانی کون کون کردن و گوێدرێژە پەلکورتەکەشی بەستەوە لە هەندێك لەو شتانەی کە جێگای مایەی فەخرو شانازیان بوون، پاشان وتیە ڕوستم کاتێك پرسیاری لێکرد: چی وای لێ کردوون بێنە وڵاتی ئێمە ؟وتی: خودا ئێمەی هێنا بوونەوە بۆ ئەوەی خەڵکی لە بەندایەتی بەندەکان رزگار بکەین بۆ بەندایەتی خودا وە لە بەر تەنگی دونیا بۆ بەرفرەوانی دونیاو ئاخیرەت ..

ئەوە چ فەخرو شانازی و سەربەرزیەکە بە ئیمان بەرامبەر بەو فەخرو شانازیە درۆیینەی شارستانیەتی ماددیو هەموو لەزەتەکانی دونیا.

---

(1) ئەم خاڵە ئەو لێکۆلینەوە زانستیەی ، کەپێویستە بۆی بکرێ بە تەواوی بۆی نەکراوە ئەم خاڵەش کاریگەری دۆڕانی خاچ پەرستانە بەرامبەر بە موسوڵمانان لە ڕاپەرینی ئەوروپا کە ئەم ڕاپەرینەیان لە بنچینەدا وەرگیراوەو پشتی بەستووە بەئیسلام . هۆیەکەش ئەوەیە، کە ئەوروپیەکان کەم جار دان بەو ڕاستیە دادەنێن ،موسولمانانیش لەو دۆڕانەی کە ئەمڕۆ تێی کەوتوونە باوەڕناکەن،کە ئیسلام ئەو کاریگەریە گەورەیەی هەبووە لە ژیانی ئەوروپا ! ئەم خاڵە بەڕاستی زۆر شایەنە کە زۆر بە بەرفراوانی لێی بکۆڵدرێتەوە.

بەڵام هەڵوێستی موسوڵمانان لە شالاّوی ئەم دواییەی خاچ پەرستەکان بەم شێوەیە نەبوو .. هەڵوێستیان هەڵوێستی فەخرو شانازی بە عەقیدە ڕاستیەکەیان نەبوو فەخرو شانازیان بە ئیمانەوەش نەبوو .. بەڵکو بەشیان شکان و دارمان و چروکی دەروونی بوو..

یان بڵێ: سەرسام بوون بوو.

بۆ یەکەم جار لە مێژوویان دەڕۆننە دوژمنەکانیان کە لەوان بەرزترن .. نەك تەنیا لەبواری زانستو تەکنەلۆژیاو ئامێرەکانی جەنگ ئەوا شتێکی ئاشکرایە .. بەڵکو لەهزرو .. سیستەم و بیروڕاو .. شێوازی هەڵس و کەوت ..

هۆکارەکەش شکانی سەربازی و جیاوازی شارستانیەتی ماددی نەبوو .. بەڵکو کەم و کوریەکە لە ئیمان بوو .. کاتێك لە جێگای بەرزو شکۆمەندی دا بوون..

﴿ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ آل عمران: ١٣٩ هەر ئێوەن کە سەردەکەون ئەگەر بڕواو بە خوا هەبێ.

هۆکارەکە تێکەتن بوو لەلایەن بیرو باوەڕ ،کەئوممەت چەند سەدەیەك کەوتەناویەوە . بۆیە دوڕانی سەربازی بووبە هۆی سەرسامبوون .

کاتێکیش کەسەرسامبوون دەستی پێکرد. ئوممەت کەوتە ناو سەرگەردانی.

## قەبارەی سەرگەردانی

بەڕاستی قەبارەی سەرگردانی زۆر گەورەبوو. زۆر لەوە مەزنتر بوو کە خەڵکی بۆی دەچوون..

هیچ لایەنەك لەلایەنەکانی ژیانی ئەو ئوممەتە نەما، کە سەرگەردانی کاری تێنەکردبێت ..هەروەکو بڵێی نیو سەدە زیاترە هەڵگەڕاینەوە بۆیە دەڵێی ئوممەتێکی ترەو گۆڕاوەو وەکو پێشوو نەماوە ؟ گۆڕاوە لە هەموو شتێك ..لەبیروو بۆچون و هزرو هەست و شێوازی هەڵسو کەوت ..لە سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕەوشت و هزرو ئاداب و هونەر..لە هەموو شتێك!

ئەو ئوممەتە بێ گومان هەستی بەو وەرچەرخانە دەکرد .. لەو ماوەیە کورتەدا جیاوازییەکی توندو تیژ بەدی کرا لەنێوان ئەوەی لەسەرییەتی و ئەوەی بۆی چوو .. بەڵام بەڵایە گەورەکە ئەوەبوو کە–کاتێك لەناو سەرگەردانی دا بوو – وای گومان دەبرد, کە وەردەچەرخێت بەرەو پاشتر؟ دەیڕوانیە خۆشی کاتێك خۆی دادەماڵی لە دین و کەلەپورو بیرو بۆچوونی کەوای دەزانی ئێستا هەنگاوی یەکەمی ناوە بەرەو ڕێگای ڕاست.

لێرەدا خاڵێك هەیە پێویستە بۆ مێژوو نووسی موسوڵمانان ڕوون ببێتەوەو بۆ خەڵکیش ڕوون بکاتەوە ..کە ئەو ئوممەتە پێش ئەو وەچەرخانە لەسەر ڕێگایەکی ڕاست نەدەڕۆیشت ! بەڵکو زۆر لاڕێ ببو لەوڕێگایە ،کەگومانی دەبرد بەردەوام لەناویدا دەڕوات ، بەڵام ئەوەی کە پێویستە بەباشی تێبگەین ئەوەیە ،کە ئەو ڕووتێکردنە نوێیە بەرەو ڕێگایەکی ڕاست نەدەڕۆیشت بەڵکو لاڕێ بوونەکی نوێ بوو لە ڕێگای ڕاست ,بۆیە زۆر ترسناکتر بوو لەهی یەکەم .یەکەم – لەگەڵ ئەو لاڕێ بوونەی کەتیایدا بوو – شێواندنێك بوو بۆ واقعێکی ڕەسەن ئەوا

سانابوو کاتێك کە شتە شێواوەکە دەردەکەوێت بگەڕێتەوە بۆ ئەو بنچینەیەی کە شتە شێواوەکە بەفیرو فێڵی خۆی وای کردبوو لێی لابدەی . بەڵام ئەوەی تریان بەئاڕاستەیەکی دژ یەك و پێچەوانەبوو, ئەو ترسناکیەی کە تیای دابوو بەردەوام وەسوەسەی ئەوەی بۆدەکرد کە بەهیچ شێوەیەك نەگەڕێتەوە بۆ ڕێگا ڕەسەنەکە.. بە گومان و بیانووی ئەوەی ,کە سەرچاوەی دەردو نەخۆشیە .. چارەسەریەکەو دەرمانەکەش بەتەنها ئەوەیە ,کە دوور بی لێی!!

ئەوەی موسوڵمانان بەجیان هێشت و ماڵ ئاواییان لێ کرد بۆ ئەوەی بچنە ناو سەرگەردانی ئەوا حەقیقەت و ڕاستی ئیسلام نەبوو..

پشت بە خەڵك بەستان و سەلبیەت و شتی پرو پوچو سستی و بێ هێزی و دانیشتن لەمەر وەگەر خستنی هۆیەکان .. لە ئیسلامدا نیە .

سوك کردنی ئافرەت و بەندکردنی لەتاریکایی و نەفامی و شتی پرو پوچ و کەم کردنی ڕۆڵی لەژیانداو گۆشە گیرکردنی تەنها لەزگ و منداڵ بوونو شیردان.. لە ئیسلام دا نیە.

زۆر داری کاربەدەستەکان بەهێزو دەسەڵاتیانو سەرزەنشت کردنی رەعیەتەکەیان لەدەست تێوەردان لە کاروباری گشتی، چ جای فەرمان بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپە .. لە ئیسلام دا نیە .

دانیشتنی زانایان لەمەر ڕوانین بۆ ئەو کاروبارە نوێیانەی، کە لەژیانی خەڵك ڕوودەدان چ جای قەدەغەکردنی ئیجتیهادو وامەزەندەکردنیشی، کە بیدعەیەکی بێ سودەو ترسناك و پڕ مەترسیە.. لە ئیسلام دا نیە.

بگرە بە دەیان کاروباری ئەوها کە بڵاو ببۆوە لەناو کۆمەڵگادا .. ئەمانە هەموو شتی نامۆو دەرەکی بوونو گشتی لاڕێ بوون بوو لە داخوازیەکانی لااله الا الله نەبوو..

بەڵام چارەسەری ئەوە نەبوو ,کەئەم دینە فڕێ بدرێ .. بەڵکو دەبا بگەڕێنەوە لایو ئەو شتانە فرێ بدەن کە لاڕێ بوونەو هاتۆتە ناو ژیانی خەڵکی .

کاروبارەکە پێویستی بەو زانا نوێ خوازە بوو، کە کاروباری ئەم ئوممەتە نوێ دەکاتەوەو ئەو پەردەیە لادەدات کە چاویانی داپۆشیوەو . دەیگەڕینێتەوە بۆ ڕیگای ڕاست..

لێك دووریەکی زۆر هەبوو لە نێوان ئەوەی رووی داو لە نێوان ئەو شتەی کە ئەو کات ئەم ئوممەتە پێویستی پێی هەبوو ..

هەڵبەت دوژمنی بۆ سەدار هەستی دەکرد کەوا بە ئاگاهاتنەوەو بێداربوونەوە بۆی هەیە ڕووبدا.. بەڕاستی بزاڤی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لە دورگەی عەرەبی ترسێکی زۆری بۆیان هەبوو , کە ڕەنگە ئەو ئوممەتە بێدار ببێتەوەو هەموو ئەو شتە نامۆیانەش داوەشێنی لە خۆی ,کە دووری خستۆتەوە لەڕاستی ئەو دینە.. لەو کاتەدا شالاوی خاچ پەرستی چی لێ دێ و سودی چیە ؟ چۆن خاچ پەرستە مۆدێرنەکان ڕوو بەڕووی ئوممەتێکی باوەڕ نوێکراوە ببنەوە هەروەکو باوکیان صلاح الدین ؟!.

بۆیە هەوڵیان دا هەر لەناو بێشەدا ئەم بزاڤە خەفەبکەنو، هانی محمد عەلی و کوڕەکانیان دا بۆ ئەوەی لەناوی ببەن .. لە هەمان کاتیشدا پەلەیان کرد لە پاڵنانی ئەم ئوممەتە بۆ ناو سەرگەردانی..بۆ ئەوەی زیاتر دووربی لە ڕێگای رزگاربوون ..

ئەو واقیعە شێواوەی ,کە موسوڵمانان تیایدا ژیان – بەگومان لەوەی ,کە واقیعی ئیسلامی بێ – ئەوا خودی خۆی سوتەمەنی بوو بۆ ئەو لاڕێ بوونە نوێیە. – بەدرۆ – بەخەڵکی وترا ئەوە دینەکەتان بوو ,کە بەرەو نەمان و فەوتانی بردنو ، ئێوەی گەیاندە ئەوەی ،کە تیایدانە لە زەبوونی سستی و چروکی .. هیچیشتان

لە بەردەمدا نییە تەنیا یەك لەودوو هەڵبژاردنە نەبێت یان دەبێت دەست بگرن بەو دینەو بەردەوام بن لەوەی تیای دان لەدواکەوتنو بێ هێز بوون . یانیش دەبێت دین فرێبدەنو ئەو ڕێگایە بگرنەبەر ،کە ئەوروپا پێش ئێوە بەدوو سەدە لەمەوبەر پیا ڕۆیشتۆ بەئەندازەی دوو سەدەش پێش ئێوە کەوت!

بەهەمان شێوە سەلبیاتی حوکمی عوسمانیش سوتەمەنی بوو بۆ ئەو لاڕێ بوونە نوێ یە..

حوکمی عوسمانی هەمووی خراپ و گەند نەبوو هەروەکو ئەوکات خەڵکیان – بەئەنقەست – واتێگەیاند بۆئەوەی لە حوکمی ئیسلامیان دەربێننو ڕێگایان بۆ خۆش بکەن بۆ حوکم کردن جگە لە شەریعەتی خوا!

ئەوەندە بەسە بۆ عوسمانییەکان – لەلای خواو لەلای خەڵکیش – کە توانیایان پەلاماردانی خاچ پەرستەکان بۆ چوار سەدە ڕابگرن ,ئەوان هەتا کۆتایی ساتی ژیانیان کەم تەرخەمییان نەکرد بەرامبەر فەلەستین، بەڵکو جیهادیان کردو خۆیان لە پێناوی بەکوشتداو ڕێگربوون لەپەلاماردانی سەهیۆنیەکان ،کە خاچ پەرستی جیهانی بەهەموو هێزی خۆی و بە هەموو ئەوەی خاوەنیەتی لەزیرەکی و بلیمەتی پشتی دەگرێت و پیرۆزبایی لێدەکات ..

بەڵام بێگومان شتی خراپیشیان هەبووە ..

ستەمێکی زۆر لەحوکمیان دا هەبووە..

بەخەڵکی وترا: حوکم کردن بەناوی دین هەر ئەوها دەبێت . چونکە بەسروشتی خۆی سەرکوتکەرە؟ هەرئەوەشی لێ چاوەڕوان دەکرێت ! بڕوانن پێشتر حوکمی دین چۆن بوو لە ئەروپا.. هەمووی ستەمو زۆرداریو طوغیانو ماف خواردنی گەل بوو , ئەوروپاش لێی بێدار نەبۆوە هەتا خۆی لە دەسەڵاتو

هێزی دین ڕزگار نەکردو تەنها گەمارۆیدا لە عیبادەتو دووریشی خستەوە لە زاڵبوون بەسەر کاروباری ژیان..

ئێوەش ..؟!

هیچ ڕێگایەکتان لەبەردەم نییە تەنها ئەو ڕێگایەنەبێت – دین گەمارۆ بدەن لەکاروباری عیبادەتو ئەوەی هاو شێوەیەتیو دووریشی خەنەوە لەهەموو لایەنەکانیتر بەتایبەتی سیاسەت گوناهباریش نابن چونکە هەر بە موسوڵمانی! دەمێننەوە ،بەڵام ئازاد دەبن ..پێش دەکەون.. شارستانی دەبن!

لە ناو سەرگەردانیش – بۆ – ئەم ئوممەتە ڕوون نەبۆوە تەنها ئەوەی خوا بەزەییی پیێ هاتبێتەوە – ،کە چ ساختەو فرِوفێڵێك لەم وشەیەدا هەیەو چەند دوورە لە ڕاستی .

ئەو دینەی ئەوروپا فرێی دا بۆ ئەوەی پێش بکەویێ و شارستانی بیێ ئەو دینە نەبوو کە لەلای خوای گەورە هاتبوە خوار،بەڵکو دەستکردێکی چەند مرۆڤێکی خراپ بوو ،بیرو بۆچونو هەواو ئارەزووی مرۆڤی خراپ تێکی دابوو .هەڵەش لەژیانی ئەوروپیەکان ئەوەبوو ،کەشوێن ئەو دینە خراپە کەوتنو شتە خراپەکانی نێویان نەزانیو وتە باوەکانی کلێسەیان وەرگرت بەوەی کە وتەیەکە شوێن کەوتنی واجبەو ، بەمەزەندەی ئەوەی ئەوانە جێنشینی بطرسنو ئەو دەسەڵاتی پێی بەخشیون،کە مەبەستیان عیسایە سەلامی خوای لیێ بیێ ..کە مافی حەلال کردن وحەرام کردنی هەیە هەروەها بیێ تاوانای (العصمة) شی پیێ بەخشی [1]!

(1) وا گومان دەبەن بە بیێ پاڵپشتیەکی ڕاست کە عیسا سلامی خوای لیێ بیێ وتەیە یەکێك لە حەواریە کان : تۆ بطرسی لە سەر ئەم بەردە کلێسەکەم دروست دەکەی,ئەوەی لەزەویدا دەیکەم لەئاسماند حەلال نیە,ئەوەی لەزەویش حەلالی دەکەم پەیوەندی بە ئاسمانەوە نیە!! ئەمەش ,کە وتەیەکە نابیێ لەدەمی هیچ پێغەمبەرێکی خوا بێتە دەریێ.

﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ التوبة: ٣١: لەبری خوادا مەلاكان و ڕەبەنەكانی خۆیان و مەسیحی فرزەندی مەریەمیان كردە خوا فەرمانیشیان پێ كرابوو بێجگە لە خوای تاك وتەنیا نەپەرستن .لە غەیرە ئەو هیچ شتێك بۆ پەرستن ناشێ . خودا بێ عەیبە و بە دوورە لەو شتانەی بە هاوتای ئەوی دەزانن.

بەڵام ئەو دینەی موسوڵمانان دەستیان پێوە گرت — ئەگەر چی لە مومارەسەكردنی لاڕێببوون — ئەوە ئەو دینە ڕاستە بوو كە لەلایەن خودا هاتبوە خوار، كە بنچینەكانی لە كیتابو سوننەت بەپاراستنی خوا پارێزراوە:

﴿انا نحن نزلنا الذكر وانا له لحافظون : ئێمە خۆمان ئەو قورئانەمان ناردۆتە خوار هەر ئێمەش دەی پارێزین .

هەڵەش لەژیانی موسوڵمانان لاڕێبوونیان بوو لە مومارەسە كردنی ئەو دینە ,جا چ بەبیدعەو گوناه بێ یان بەهۆی هەڵاتن لە ئەركەكان یان بەهۆی هاتنە ناوەوەی فیكری ئیرجائو سۆفی ,كە دوو فیكری لاڕێبوون.

بۆیە چارەسەری لە هەردوو بوارەكەدا جیاوازی هەیە .چارەسەری لە لای ئەوروپا فڕێ دانی دینە گەندەكەیان بوو چارەسەریش لە لای موسوڵمانان فڕێ دانی ئەو لاڕێ بوونانە بوو ,كە هاتبووە سەر هەڵسو كەوتو ڕەوشتیانو گەرانەوەش بوو بۆ دەست پێوە گرتنێكی ڕاست و دروست بە دین.

ئەم چارەسەریە چەند دوورە لە وی تر!

بەڵام ئەوروپا نیوەی چارەسەریەكەی وەرگرت ونیوەكەی تری وەرنەگرتو ڕتی كردەوەو دەرچوو لە دینە گەندەكەیو نەهاتە ناو دینی هەق ،جا لەوەوە ئەزمەیەك سەری هەڵدا، كە ئەمڕۆ ڕۆژئاواو مرۆڤایەتیش لەگەڵیدا پێوەی دەناڵێنن , كە ئەو مرۆڤایەتیە لەكاروباریدا دەست بەسەرە لەژێر پەستانی ڕۆژئاوا:ئەویش زاڵبوونی روحی ماددیەتەو لەناو چوونی لایەنی گیانی مرۆڤە لەژێر پەستانی ماددە– بە گوزارشتێكی تر– پێشكەوتنی لایەنی عیلمیو ماددیو تەكنەلۆژیە بەبێ ڕەوشتو ئەخلاق!

بەڵام ئوممەتی ئیسلامی – لەناو سەرگەردانی – نەنیوەی چارەسەریەكەی وەرگرت نە چارەگی نە هەشتیەك ..بەڵكو ئەو ژەهرەی خوارد كە ڕۆژئاوا پێشكەشی كرد، كە لە خۆشیان زوو قوتیدا بە گومانی ئەوەی ئەمە ڕێگای دەرباز بوونە!

لە باتی ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەودینەی ,كە لاڕێ ببوو لێی ,دینەكەی فرێدا– یان نزیك بوو– فڕێی بدا، لە هەمان كاتیشدا ئەو هۆكارانەی نەگرتە بەر،كە ئەوروپا گرتیە بەر لە پێشكەوتنی زانستیو ماددی .كە لە زانستدا تەنها توێكلەكەی وەرگرتو ,ئەودەست پێشخەریەشی نەكرد، كە پێویست بوو بۆی بكاتو ئەوتاقەتو كۆل نەدان و ئارامیەی بەكارنەهێناو ئەو ڕێكخستنە سەركەوتووەی نەبوو بۆ كاروباری ژیان كە وادەكات ماندووبوونەكە بەردار بێتو هێزو توناش كۆ دەكاتەوە كە نەهەڵ دەپروكێو نە تیكە تیكەش دەبێت !

لەباتی ئەمە ئەو گەندەیەی وەرگرت ،كە لە ژیانی ڕۆژئاوا دا هەبوو! چەند جارە گەندەیەكە كەپكەی كردەسەر یەك‌و ! چارەسەری ئەو نەخۆشیانەی نەكرد كە بۆی مابۆوە لەماوەی بەدواكەوتنی لەلایەنی عەقیدە، كە پێش ئەوە دواكەوتبوو لەلایەنی جەنگی و سیاسی و زانستی و ماددی ..هتد . چەند

نەخۆشیەکی تری بۆ زیاد بوو،کە نامۆو دەرەکی بوون لەمەڕ ژینگەی ئیسلامی, بگرە لە هەڵوەشانەوەی ڕەوشت و ئارەقو قومارو ڕابواردنو خۆ هەڵکێشان بە تاوانە گەورەکان ..

هەروەها ئوممەت – کاتێك لە ناو سەرگەردانی بوو– لەو جیاوازیە نەگەیشت ,کە لە نێوان ئەو چارەسەریەی ،کە پێویست بوو بیگرێتەبەر بەرامبەر ستەمی حوکمی عوسمانیو ئەو چارەسەریەی ڕۆژئاوا وەکو بەدیلێك پێشکەشی کرد..

هەڵە لە حوکمی عوسمانی زۆرداری سیاسی بوو ..ئەو چارەسەریەی کە پێویست بوو بۆ ئوممەت پێشکەش بکرێ پەروەردەکردن بوو لەسەر روحی ئیسلامی بۆ سیاسەت ئەویش گوێ ڕایەڵی کردنی حاکمە بۆ ئەو شتانەی کە حاکم تیایدا گوێ ڕایەڵە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی هەروا چاودێری کردنی ئوممەتە بۆ کردەوەکانی حاکم هەتا بە رێکخەری شەرعی هەڵسوکەوتی ڕاستە ڕێ دەبێت .هەروەکو کە لەو تاکە نموونەیەدا ڕوون دەبێتەوە، کاتێك عومەر رەزای خوای لێبێ ڕاوەستا بوو بۆ ئەوەی وتار بخوێنێتەوە بۆ خەڵکی وتی : ئەی خەڵکینە گوێ ڕایەڵ بن، سەلمانی فارسی رەزای خوای لێبێ پێی وت : ئەمڕۆ گوێ رایەڵیت ناکەین ! عومەر وتی : بۆچی ؟ وتی هەتا بۆمان ڕوون نەکەیتەوە، ئەو پۆشاکەت لە کوێ بوو ،کە تۆ پیاوێکی درێژی پارچە قوماشێك بۆ عەباکەت بەش ناکات هەروەکو ،کە بۆگشت موسوڵمانەکانی دیکە بەش دەکات ! جا کاتێك بۆ سەلمان ڕوون بویەوە ,کە ئەو پارچە قوماشە زیادە هی عبداللەی کوڕیەتی پێی بەخشیوە بۆ ئەوەی جلەکەی پێ تەواو بێت ئەوجا وتیە عومەر : ئێستا گوێ رایەڵت دەبین !

ڕاستە ئەم ئوممەتە لەو مافە خواییەی لەسەری بوو بۆ چاودێری کردنی کردەوەکانی حاکم وئامۆژگاری کردنی کەم تەرخەمی کردو سستی نواندو هیچ عوزرێکیش وەرناگیرێ هەتا ئوممەت حاکم لەسەر کارە خراپەکان ڕاست نەکاتەوە هەروەکو ،کە پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت فەرمووی (( لا والذی نفسی بیدە حتی تاطروهم علی الحق اطرا [1]: نەخێر سوێند بەوکەسەی : نەفسی منی بەدەستە هەتا نەیان گێڕنەوە بۆ لای هەق ))

بەڕاستی ئەو کەم تەرخەمیە لە ژیانی ئەو ئوممەتەدا کۆنە هەر لە کاتی (بنی امیە) دا هەبووە، زۆرداری عوسمانیەکانیش سەرتای لاڕێ بوون نەبوو بەڵکو تەنها درێژ بوونەوەیەکی مێژوویی بوو بۆی.. بەڵام ئەوەی واجب بێت هەر واجب دەبێت با ئوممەتیش کەم تەرخەمی لە ئاست بنوێنێتو بە کۆنیەکەشی لاناچێ با ماوەیەکی دوورو درێژیش بەسەریدا تێپەڕی ..چاکسازی پێویستیش بەردەوام دەمێنێ و ناگۆڕێ چاوەڕێی ئەو زانا خوا پەرستە نوێ خوازە موجاهیدە دەکات ،کە ئوممەت دەگەڕێنێتەوەبۆ بنچینەکەی ،کە لێی لاڕێ بووە. با لەپێناویشیدا گیانی خۆی بەخت بکا هەروەکو زۆر لە زاناکانی ئیسلام لە مێژوودا وایان کردووە.

بەڵام ئەو چارەسەرییەی ئوممەت وەری گرت– کاتێك لە ناو سەر گەردانیدابوو – ئەوا بە تەواوی پێچەوانەی ئەمە بوو..

ئەو چارە سەرییەی وەری گرت لادانی شەریعەتی ئیسلامی بوو هاوردکردنی یاساو ڕێسابوو لە ڕۆژئاوا بۆ ئەوەی ((دەوڵەتێکی مۆدێرن ))وەکو دەوڵەتە ئەورووپیە مۆدێرنەکانی پێ دابمەزرێنێ !

چەند دوورە ماوەی نێوانی ئەم دوو ڕێگایە !

---

(1) روە ابو داود والترمذی

ئوممەت — لەناو سەرگەردانی — پەی نەبرد بەرەهەندەکانی دۆزەکەی لە سەر حەقیقەتی خۆی..

هەڵەکانی ژیانی ئوممەتی ئیسلامی لە شەریعەتەکەی سەری هەڵنەدا هەتا چارەسەریەکە ڕەت کردنەوەی شەریعەت بێت ! بەڵکوسەری هەڵدا لە دەست پێوەنە گرتنی ئوممەت بەو مافانەی ،کە شەریعەتی خوای بۆی دەستەبەرکردبوو ..چارەسەری ئەوەش خوازتنی یەك لە سیستەمەکانی ئەوەروپاو هەوڵدانی جێبەجێ کردنی نیە .لە مەودوا دەبینین کە سیستەمە ئەوروپیەکان تەنها یەك گرفتی لە گرفتەکانی موسوڵمانان چارەسەر نەکرد!

گرفتی ئەوروپا لە سەدە تاریکیەکانی ناوەڕاستیدا سەری هەڵدا لە حکومی( ثیوقراطی ) یانی حکومی پیاوانی دین ئەوانەی ستەمیان لە خەڵکی دەکرد لە ئەنجامی ئەو باڵادەستیە روحیەی ،کەلە دینە گەندەکەیاندا هەیان بوو لەسەر خەڵکی ،کە کاهینەکانی خۆیان کردبووە پێناو لە نێوان بەندەو خوادا بەهۆی گۆڕینی عەقیدەیانو بەخشینی پیرۆزی (قداسە)بە کەسانێك کە لە نێو مرۆڤەکان شایەنی ئەو پیرۆزییە نەبوون ،هەروەها لابردنی شەریعەتو پێشکەش کردنی دینیش بە عەقیدەیەکی— گۆڕاو— بەبێ شەریعت!

هەموو ئەو خراپ و گەندیە لە بۆ چوونی ئەوروپا چارەسەری نەبوو تەنها دابڕانی دین لە سیاسەت نەبێت واتە دوورخستنەوەی دەستەڵاتی پیاوانی دین لە کاروباری سیاسەتو بەعەلمانی کردنی سیاسەت بەبێ دەست تێوەردانی دین... ڕەنگە ئەوروپا هەر ئەو چارەسەریەی هەبووبێت چونکە هەمیشە دینی نەناسیوەو لە ژیاندنیشاندا مومارەسەی دادگەریەکی پشت قایم بەدینی خوای نەکردوە.

بەڵام ئەوروپا کاتێك نێری پیاوانی دینی داماڵاند لە سیاسەت — تاقی کرایەوە بەستەم و زوڵمی پادشاو بەتریکەکان ئەوانەی بانگەشەی دابڕانی دینیان

کرد لە سیاسەت بۆ ئەوەی هەر خۆیان ئەو دەستەڵاتە بگرنە دەست و چڵیسیان بە دەسەڵات تێربکەن بەبێ مونافەسە کردنی پیاوانی کڵێسە.ئەو ستەم و زوڵمە لە ئەوروپا بووە هۆی هەڵگیرساندنی شۆرشە یەك لە دوایەکەکان بۆ لە ڕیشە هەڵکێشانی – کە بە شۆرشی فەرەنسی – دەستی پێکرد دیموکراسیەتیش ئەو چارەسەریە بوو، کە ئەوروپا پەی پێبرد بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی ئوممەت بۆ چاودێری کردنی کردەوەکانی حاکمو یاسادانانیش کرا بە مافی ئوممەت بۆ ئەوەی حاکم بەتەنها داینەڕیژێ.

لێرە جارێ چاومان لادەدەین لەوەی ,کە ناکرێ چاوی لە ئاست لابدەین، لە هاتنەناوەوەی جوولەکە بۆ ناو یاریەکەو رازاندنەوەی دەسکەوتەکانی دیموکراسیەت لە حیسابی تایبەتی خۆیان یانی لە حیسابی ئەو سەرمایەی، کە هەر خۆیان لە دەست پێکی شۆڕشی پیشەسازیەوە پسپۆرو بازرگانی بووینە ،هەروەها لە حیسابی تێکدان و خراپ کردنی ڕوەشت ,کە لە ناو کۆمەڵگای ئەوروپی زۆر شەیدای بڵاوبوونەوەی بوون بۆ ئەوەی سواری پشتی ئوممیەکان بنو ژێر دەستیان بکەن بۆ خزمەت کردنی خۆیان (1) ئەمەش لە میانەی ئەو مەبدەئە ترسناکەی کە کردبوویانە دورشمێك بۆ شورشە کە ئەمە بوو - Laissez Fair Laissez Passer،. لێی گەرێ (باشت بکات بە ئارەزووی

(1) جوولەکە لەتەلمودەکەیان دا دەڵێن ((ئومەمیەکان گوێ درێژن خوا دروستی کردونە بۆ ئەوەی گەلی هەڵبژێردراوی خوا (شعب الله المختار ) سواری پشتیان بێ هەرکاتێك کەرێك کەلکی نەما سواری کەرێکی دی دەبین)) ئەوەیە ڕوانینیان بۆ ئومەمیەکان یانی هەموو ئوممەتێك جگە لە جوولەکە. دیموکراسیەتی سەرمایەداریش یەکێکە لەو هۆکارانەی بەکاری دەهێنن بۆ دەست بەسەرکردنی ئومەمیەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان .ئەگەر دەتەوێت باسی((دیموکراسیەت )) لە کیتابی (مذاهب فکریة معاصرة ) بخوێنەوە.

خۆی) ،لێی گەڕێ بابڕوا (بەئارەزووی خۆی) یانی سەربەستی سەرمایە بۆ ئەوەی به کەیفی خۆی قازانج بکاتو سەربەستی خەڵکیش لە بێ باوەری و خراپ کردنی ڕەوشت بە ناوی سەربەستی کەسێتی ، بە چاو لادانێکی کەم لە هەموو ئەو شتانەوە ،بەڕاستی دابڕانی دین لە سیاسەت چارەسەرێکی ئەوروپی بوو بۆ گرفتێکی ئەوروپی ڕووت لەسەرەتاوە سەری هەڵدا لەوەی ئەوروپا خاوەنی دینێکی ئاسمانی نیە بگەرێتەوە لای ،بەڵکو خاوەنی عەقیدەیەکی — گۆراوە — بەبێ شەریعەت .

هەرچی موسوڵمانانیشن ئەوا گرفتەکەیان زۆر زۆر دوور بوو لەو ڕیڕەوە ئەگەر چی بالێك چوونەکی رواڵەتیش هەبوو بێ لە زۆرداری حاکمەکان بەدەستەڵاتی سیاسیان ...ئەو ژەمەی دایەنێ، کە ئەوروپا بەکاری هێنا گرفتەکانی چارەسەر نەکردن بەڵکو چەند گرفتێکی نوێی بۆ زیاد کردن ! وەکو پزیشکێکی نەزان ،کە نیشانەیەك لە نیشانەکانی نەخۆشێك وەردەگرێت —کە چەند نەخۆشیەکی تریش بەشدارە لەو نیشانەیە — بۆ نموونە ژەمێك لە دەرمانی تای سەحائی دەداتێ بۆ نەحۆشی گرانەتا — چونکە پلەی گەرمی لەشی بەرز بوویتەوە ! ,کەنەك چارەسەریەکە شیفای نەخۆشەکە نادات بەڵکو بەرگری لەشی بێهێز دەبێت وحاڵەتەکەی بەرە بەرە بەرەو خراپتردەچێ!

گرفتی موسوڵمانانیش — هەروەکو پێشتر باسمان کرد — کەم تەرخەمی بوو لەو مافە سیاسیانەی ،کە شەریعەتی خوایی بۆی دەستەبەر کردبوون [1],کە

(1) ئەوەی سەرنج رادەکێشێ ئەوەی دیموکراسیەت ناوی دەنێ مافی گەل بۆ چاودێری کردنی کردەوەکانی حاکم شەریعەت بە پێویستیکی فەرز لەسەر ئوممەت ناوی دەبا.

چاك ترین سیستمی سیاسی لەسەر زەوی دامەزراند کاتێك لە ماوەی خیلافەتی ڕاشیدی بە تەواوەتی جێ بەجێ کرا.

ئەو چارەسەریەی – کە پێویستە لەسەر زانای خواناسی تێکۆشەری نوێ خواز پێشکەشی بکات – ئەوا گەڕاندنەوەی ئەو ئوممەتەیە بە ڕێگای پەروەردەکردنو ئاراستەکردن بۆ ئەو روحەی ،کە موسوڵمانەکانی پێشینان پێ ژیان و بە تەواوی مومارەسەی دینیان پێ کرد لە جیهانی واقیعدا .

هەرچی خوازتنی دیموکراسیەتو هی ترە لە سیستەمەکانی ڕۆژئاوا [1]، لەگەڵ لابردنی شەریعەتی ئیسلامی لە حوکم چی لە واقیعی ئەو ئوممەتە کردو گەیاندیە چ ئاقارێك ؟

بەراستی گەیاندیە کۆمەڵێك لە خراپەکاری ،کە تائێستا ئەو ئوممەتە لە ئەنجامەکانی دەناڵێنێ هەر ئەوهاش دەمێنێتەوە هەتا دەگەرێتەوە بۆ لای خواو چاك سازی لە هەڵەکانیدا دەکات بەو چارەسەریە خواییەی ,کە خودا ناردویتە خوار ،کە رێنمایکەرە بۆ خەڵك و شیفای دەروونەکانیشە.

هەرچی لادانی شەریعەتیشە ئەوا پاش کەمێکی تر باس لەو خراپیە دەکەین ،کە سەری هەڵدا لە کۆمەڵگای سەرگەردانی .

دیموکراسیەتیش لە جێ بەجێ کردنی واقیعدا بوو بەشتی گاڵتە جاری‌و، چەند خەمێك و پەژارەیەکی تری هێنایە ناو ژیانی خەڵکی .

کاتێك میسریەکان شۆرشی نیشتیمانیان [2] بەر پا کرد لە ساڵی 1919 تشرشل بلیمەتی گەورەی بەریتانی لەوکاتەدا لە حوکمەتی پارێزگاران وەزیربوو

(1) سەرەتا دیموکراتیەت هاوردەکرا پاشان ئیشتراکیەت ئێستا دەگەڕێنەوە لای دیموکراتیەت بەمەرجێك موسوڵمانان هەمان شت نەکەن!

گوێی لە هەواڵی شۆرش بوو پرسیاری كرد : میسریەكان چیان دەوێ ؟ پێیان وت دەیانەوێ پەرلەمان و یاسایان هەبێت جا بە گاڵتەوە وتی :

یانی یاریكیان بدەنێ با (give them a toy to play with it)) خۆیان پێ خەریك بكەن))!! .

هەرچی شتەگاڵتەكانیش بوو ئەوا سەری هەڵدەدا لەدەست تێوەردانی توندو بەهێزی دەسەڵات بۆ سەركەوتنی هەڵبژێردراوی حكومەتو ساختەكردن لە هەڵبژاردن و، قۆستنەوەی نەخوێندەواری هەڵبژێرانو،كڕینی دەنگەكان بە پارەو، هەڵوەشاندنەوەی سندوقە پاكەكان وهێنانی هیتر لەجیاتی،كە پێشتر ئامادە كرابوو بەرێژەیەكی دیاری كراو (99.9٪ )! هەروا گرتنی نەیارانی بۆ ئەوەی نەچنە ناو هەڵبژاردن ودابەش كردنی فەرمانگەكان ،كە خزمەتی بەرژەوەندیەكانی هەندێك لەهەڵبژێردراوەكان دەكات لەسەر حیسابی ئەوانی تر ..

هەرچی ناخۆشی وناسۆریە ئەوا كەمەكەی پەرتەوازەكردنی خێزان ودیتنەوەی دژایەتی هەندێك بۆ هەندێكو ،بەڵكو هەندێك جار دژایەتیو دوژمنداری دەكەوتە ناو یەك خێزان ،ئەمەش لەئەنجامی ئینتیماكردن بۆ حیزبە پەرش وبڵاوەكان و،بڵاوكردنەوەی درۆی سیاسی وهەڵخەڵەتاندنی ئاپۆرەی خەڵك بەچەند بەڵێنێكی هەنگویناوی و بڵاوكردنەوەی خزم خزمانێو دەوڵەمەندكردنی هەر حیزبێك،كە بگەیشتبایە حوكم بەچەند وەزیفەیەكی دەوڵەت لەلایەن شوێن كەوتەو دووڕووەكانی ،كەخاوەن شارەزایی نەبوونو شایەن نەبوون بۆ جێگەكانیان بەبێ گوێ دانە ئەوەی ،كە چ كارێك دورست دەبێت لەبەفیرۆدانی بەرژیوەندیەكانی

(1) شۆرشكە لە رەچەڵكدا ئیسلامی بوو ،دوایی سعد زغلول هات كردی بە نیشتیمانیەكی عەلمانی لە ژێر دروشمی ئاین بۆ خوداو نیشتیمانیش بۆ هەمووان ! ئەگەر دەتەوێ تەماشای چیرۆكی سعد زغلول بكە لە كیتابی واقعنا المعاصر لا311–324

ئاپۆرەی خەڵك ..ئەمە چ جای دەوڵەتی خاچ پەرستی ،کە هەر خۆی لەناوچەکە باڵادەست بوو,کە لەڕاستیدا هەر ئەو لەمیانی ئەو حیزبانە حوکمی دەکردو ئاپۆرەی خەڵکیش لەمانە بێئاگابوو ئاوڕی لێ نەدەدایەوە چونکە لەو ڕق بەرایەتیە پڕوپووچەی لەنێوان حیزبەکان داهەبوو ماندوو شەکەت ببوو ،کە تاوانەکە چەند جارە دەبۆوە بەهۆی داپۆشینی دوژمنی حەقیقیو،سەرف کردنی هەموو وزەو تواناکە بۆ ڕق بەرایەتی حیزبەکان هەندێکیان دژی هەندێك !

لەڕاستی ئەمانە هەمووی بووە هۆی شتێکی زۆر دژوارترو خراپتر. . ئەویش ئەو کوتەدا سەربازیانەی،کەهەڵگیرسا بە بیانووی چاکسازی ئەو خراپیەی حیزبەکان کردبوویان لە ژیانی خەڵکدا ! !

بەڕاستی کودەتدا سەربازیەکان ترۆپکی دەردو ئێشەکان بوو ..

گەلانی عەرەبی شۆڕشیان بەرپا کرد دژی ستەمی فەرمان ڕەوایی تورکیو ،داوای سەربەخۆییان کرد لە دەوڵتی عوسمانی بۆ ئەوەی لە ستەمەکەیان قوتاریان بێ [1]، جوولەکەو دیانیش پێکەوە پێیان ڕابواردن لەرێگای لۆرنس پیاوی سیخوڕی بەریتانی ، کە لەڕاستیدا سەرکردایەتی شۆڕشە گەورەکانی عەرەبی کرد –، تێیگەیاندن ،کە سەربەخۆییو دادگەری سیاسی و سەردەمایاتی و شارستانیەت و پێشکەوتن بەدەست دێنو ،جارێکی تر لەپاش شۆڕشەکە بە مودێرنی لە دایك دەبن و ، خەونەکانیان دێنێتەدی ,کە لە مێژووتا ئێستا شتی وای بۆ نەهاتبێتە دی!

(1) گەلی تورکی شۆڕشی پەرپا کرد – یان پێیان بەرپاکرد – بە شیشی لە پاش شۆڕشەکە لە سەر دەستی ئەتاتورك زۆر خراپتر بوو لەوەی سکالای بەرامبەردا دەکرد لە حوکمی سەلاتینەکان!

شۆڕشی گەورەی عەرەب کاری خۆی کردو، یەکڕیزی جیهانی ئیسلامی تەفرو توناکرد ، بە ئاشکراش لە جەنگی جیهانی یەکەمدا [1] بەشداری کرد لە رووخانی دەوڵتی عوسمانیو ئەو هێڵە ئاسنینەشی تێکدا کە سوڵتان عبد الحمید لە نێوان ئەستمبۆڵ و شاری مەدینە دایمەزراندبوو ، پاشان .. بەریتانیاو فەرەنسا وڵاتی جیهانی ئیسلامیان دابەش کرد لە نێوان خۆیان ، دابەشیان کرد بۆ چەند دەوڵەتۆکەی بێ هێزو چروکو هەژارو سەرشۆڕو زەبوون بۆ داگیرکاری خاچ پەرستی ، فەلەستینیش کرا بە ئامانجی یاریەکەکە لە ژێر ئینتدابی بەریتانی ، بۆ ئەوەی لە پاشان وەکو ڕێخۆشکردنێك تەسلیم بە جوولەکەکانی بکەنەوە بۆ دامەزراندنی ئیسرائیل .

ئەوە بوو نرخی ئەو شۆڕشەی کاتێك وڵاتە عەربیەکان بەرپایان کرد – یان پێیان بەرپا کرد – دژی ستەمی حوکمی عوسمانی : سەربەخۆیی لە دەستدا ،کەرامەت و رێزی لەدەستدا ، ئەو زەویە پیرۆزەی لە دەستدا ،کە خوای گەورەی پیرۆزی کردبوو کردبوویە شەوڕۆیی پێغەمبەر – صلی الله علیه وسلم، کە یەکێکە لەو سێ حەرەمەی خوا پیرۆزی کردووەو کەوتە ژێر دەستی ڕۆژ ئاوای خاچ پەرست و جوولەکەکانیش بە بێ هەق لە سەرانسەری سوڕانەوەو گەندەڵیان کرد .

وەنەبێ ستەم و زوڵمی عوسمانیەکان مەقبوڵ بووبێو بێ دەنگ بوونیش لە ئاستی شتێکی ڕەوا نەبوو لە شەرعی خودا ..بەڵام بە تێکڕایی ئەو چارەسەریەی پێشکەش کرا بۆ ئوممەت زۆر خراپتر بوو لەو بارەی پێشترموسوڵمانان سکاڵایان بەرامبەردا کرد هەتا قسەی ئەو شاعیرەیان لە سەرهاتەدی

---

1 لۆردئەلنبی– سەرکردەی سەربازی عەرەبی– وتی: ئەگەر بە یارمەتی لەشکرتاریەتی عەرەبی نەبوایە نەمان دەتوانی بەسەر تورکیا زاڵببین! !

رب يوم بكيت منه فلما      صرت في غيره بكيت عليه

یانی زۆر جار لە دەستی ڕۆژگارێك گریاوم بەڵام کاتێك چوومە ڕۆژگارێکی تر گریام بۆ رۆژگارەکەی گلەییم لێهەبوو

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە ترۆپکی دەردو ئێشەکان نەبوو ...

ترۆپکی – هەروەکو ئاماژەمان پێدا– کودەتای سەربازی بوو ،کە هات بۆ چاك سازی ئەو گەندەیەی کەهەنگاوی پێشوو هێنایەکایەوە ,ئوممەت ڕزگاری بوو لە دەسەلاتی ئەو بێگانەی کە جیهانی عەرەبی داگیرکرد پاش ئەوەی دابڕا لە دەوڵەتی دایك !!

ئوممەتی ئیسلامی هەتا ئێستا لە مێژووی خۆی ئەوەندە ستەمی نەچەشتوە ئەوەندی چەشتی لە ستەمی کوتەدا سەربازیەکان .ستەمی سیاسی لە سەردەمەکانی پێشوو سنوور داربوو.. تووشی چەند کەسێك یان کۆمەلێك دەبوو کاتێك – سولتان لییان تووڕە دەبوو بەلام مرۆڤی ئاسایی هیچ تووشی ستەم نەدەهات مەگەر تەماعی والیەکان لە ماڵی یان ئەوەی لە باجی زۆر زۆر لەسەریان فەرز دەکرد لەگەڵ ئەوەی هەژاریش بوو .. بەڵام دەچووە سەرکاری خۆی ئەمین بوو دەهاتە ماڵێ ئەمین بوو لەگەڵ برادەرەکانی دادەنیشت لە دێ یان لە شار ئەمین بوو شەو دادەنیشتن بە سەرهاتیان دەگێڕایەوە یان دەربارەی ئیش وکاریان وتووێژیان ئاڵ وگۆڕ دەکرد یان– بەنهێنی– جوێنیان بە والی دەدا بەڵکو جاری وا جوێنەکە لە والیش تێپەڕیوەو جوێنیان بە خودی سولتان داوەو..ئەمینیش بوونە !

هەرچی حوکمی سەربازیشە شتێك بوو دڕندایەتیەکەی هەموو سنورێکی بەزاند..

**ئەمن و ئاسایش نەما..**

سیخوڕەکانی حاکم هەناسەی خەڵکیان ئەژمارد .واوەیلاش بۆ ئەوکەسەی قسەیەك بکاتو تیایدا ڕەخنە لە تاکە کردەوەیەکی فیرعەونی زۆردار بگریٚ..بەندیخانەو ئەشکەنجەو دەربەدەری بەشیەتی..یان جاری وابوو چ لە رۆژ چ لە شەو لەبەندیخانەکەی دەمرد لە کاتی ئەشکەنجەدانیو خزم و کەسی غیرەتی ئەوەیان نەدەکرد– نالییێن سکاڵا بکەن– بەڵکو هەتا لێشی بپرسن : ئایا زیندووە یان مردووە..ئەوەی پرسیاریش بکات ئەوا لەسەر پرسیارەکەی دەبردرێت جا ئایا دەگەڕێنەوە یا ناگەڕێتەوە !

هەروەها جۆرەها ئەشکەنجەدانیش کەدڕندەکان خۆی لیٚ بە دووردەگرن..

دڕندەکان ڕاودەکەن بۆئەوەی بخۆن کاتێك تێری خوارد واز لەڕاوەکەی دەهێنێت . ڕاوناکات بۆ ئەوەی نێچیرەکەی ئەشکەنجەو ئازار بداو چێژو تام لەو ئازارە وەربگریٚ کە کردویتە سەری هەروەکو ,کە مرۆڤ لەکاتی لەدەست دانی مرۆڤایەتیەکی وادەکاو بۆ خوار خوارەوە سەرەو ژێر دەبیٚ.

بەڕاستی سەرباز هەموو ئەو دڕندایەتیەی تاقی کردەوە لەکاتێك کەگەلیان لەترس رزگاردەکرد! ڕزگاریان دەکرد لە زەبوونی! ڕزگاریان دەکرد لە بەندایەتی! یەکێك لەو تاغیانە لە کاتێك دزێوترین جۆری زەلیلی و زەبوونی تاقی دەکردەوە لەسەر گەلەکەی وتی : برالە سەرت بەرزکەوە ! عەهدی ستەمو زۆرداری بەسەرچوو!!

خەڵکی زەبوون بوونو.. دەروونیان شکاو نوشستی هێنا..ترسو بیمی بکوژ دای گرتن لە میوانی شەو ،کە خەڵکی لەکن ژن و منداڵیان بە شەو لە ماڵ دەردەهێنا بۆ ئەوەی فرێی بداتە تاریکایەك کەس مەداکەی نەزانێت بەڵکو یەکەم جار لە مێژووی ئەو ئوممەتە ئافرەتیش بردران بۆ ئەوەی ئەشکەنجە بدرێن لە بەندیخانە .

لەگەڵ ئەو سام و ترسەش هەژاری هەموو گەلی گرتەوە تەنها ئەو بەبەختانە نەبێ کەگیرفانیان پڕببوو لە سامانی حەرام ,کە بەزەبری هێز دزرابوو لە ئوممەت.. کەرامەتو ڕەوشتی ئوممەتیش نەماو وێنە بەرزو بەهاکانی هاڕدراو مەبەستی گەورەی خەڵکیش بووە گەڕان لە دوای پاروە نانێ,کە زۆر بەپەرۆشی دەگەڕا لەدوایدا هەتا دەیدیتەوە –ئەگەر بیدیتبایەوەش – ئەوا لەناو زەبوونی و ترس و نزمیدا خوساو بوو.

**ئەم هەموو شتانە لە حیسابی کێ روودەدا؟!**

لەحسابی کێ گەل دەپڵخێننەوەو کەرامەتی بەزەویدا دەدرێ و تاغیەکان بەپێ بسەری دەکەون؟!

لەحیسابی خاچ پەرستی جیهانی وسەهیونیەتی جیهانی, هەتا ئیسرائیل ئارام و جێگیرو بەرفراون ببێ, گەلانی ئیسلامیش لە دەوریدا زەبوونەو ناتوانێ بەرهەڵستی بکات ئەمە چ جای ڕەت کردنەوەی..چ جای جیهاد کردنی دژی داگیر کەران.

ئەوە بوو ئەوشتانەی گەلەکان دەستیان کەوت لەشۆڕش کردن دژی ستەمی عوسمانیەکان!!

جارێکی تر دەڵێین : ستەمی عوسمانیەکان شتەکی مەقبوول نەبوو بێدەنگیش لە ئاستی دا مەقبوول نەبوو لەشەرعی خودا.بەڵام ئەو چارەسەرییەی ئوممەت وەری گرت– کاتێك لەناو سەرگەردانیدابوو– زۆر خراپتر بوو زۆر تاڵ تربوو,هەمووی زەبوونیو چروکیو فەوتان بوو.

سەیریش لەوە دایە ,کە – بەردەوام– لە ناو سەرگەردانیدا دەۆڵ لێدەرو شمشال ژەن هەبوونە ,دەهۆلیان لێداوەو شمشاڵیان ژەنیوە بۆ هەرقۆناغێك لە قۆناغەکانی سەرگەردانی .ئەگەر قۆناغەکی نوێتریش بهاتبایە نەفرەتیان لەوەی

پێشوو دەکرد ،کە دەهۆڵیان بۆ لێدابوو شمشاڵیان بۆ ژەندبوو, بۆقۆناغە نوێیەکەش بەهەمان گەرم و گوڕیو هەمان دۆستایەتی! دەستیان دەکردە دەهۆڵ لێدانو شمشال ژەنین!

کاتێکیش دیموکراسیەت هاتو ئەحزابەکانیش دورست بوون چوونە ناو جەنگ دژی یەکتر بانگخوازان هەلهەلەو تەکبیریان بۆ لێدەداو وتیان : ئێستا ئوممەت ڕزگاری بوو پێشکەوتو دەتوانێ لە میانی حیزبەکان ویست و مەبەستی خۆی دەرببڕێ .. کاتێکیش دیکتاتۆریەتی ئیشتراکی هات بانگخوازان هەستان بەنەفرەت کردنی سەردەمە لەناوچووەکان ,کە ئوممەتی تێکدا بەو ڕق بەراتیەی کە لە نێوان حیزبەکاندا هەبوو کە سام و هەیبەتی نەهێشتو یەك ڕیزیەکەی ونکرد ...لە هەمان کاتیشدا ئەوەیان ڕاگەیاند ,کە کاتی ئەوە هاتووە ئەو ئوممەتە یەك بگرێ و رزگاری بێ لەخراپیو ,کەسایەتیە ون بووەکەشی بگەڕێنێتەوەو لەسەر ڕێگای سەرکەوتندا بڕوات..!

دۆڵ لێدەروشمشالێ ژەنەکان ..لە نووسەرو ڕۆژنامە نووسو ..وتار بێژوو هونەرمەندان و چیرۆك گێڕەوەو شانۆییەکان خولانەو ئومەتیش لە دوایاندا خولاوە لە تاریکایی سەرگەردانی !

*   *   *

ئەمەش تاکە سەرگەردانی نەبوو لە بواری سیاسەتدا ...

بەڕاستی بانگەشەی نەتەوایەتیو نیشتیمان گەری بڵاوکرایەوەو بڵاو بویەوە لە بەرامبەر یەکریزی ئیسلامیدا ..

یەك ریزی ئیسلامی لە مێژووی ئەو ئوممەتەدا دەعوەو دەعوە کاری نەبووە..بەڵکو واقیعەکی ژیان بووەو، ئوممەت جگە لەمە بیری لە هیچ شتێکی تر نەکردۆتەوە بە حوکمی ئەوەی بە ئیسلامەوە پابەند بووە .

بەڕاستی دەوڵەتی ئیسلامی زیاتر لە جارێك لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لێك هەڵوەشایەوە لە بەر زۆر هۆكار ،بەڵام هەست كردنی ئوومەت بەوەی ئوومەتێكی یەك ڕیزو یەكگرتوە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هیچ لێك هەڵوەشانەكەی كاری تێنەكرد بەڵكو ئەو جەنگانەش كاری تێنەكرد،كە لەنێوان هەندێك وڵاتانی ئیسلام ڕوویاندا ، خۆ وڵاتەكان بە سوڵتەنەكانو ئەمیرەكانی شتێكەو ئوومەتیش بە یەك ڕیزی عەقیدەكەیو یەكتایی دروشمەكانیو یەكتایی هزرەكانیو یەكتایی بەهاو بیروبۆچوونەكانی شتێكی ترەو، هیچ پەیوەندی بە ڕقبەرایەتی سوڵتان و ئەمیرەكانەوەنیە..

هەتا ئوممەت كەوتە سەرگەردانی ..

لەو كاتەدا بۆ یەكەم جار لە مێژووی خۆی یەكتاییو یەك ریزیەكەی لێك هەڵوبوەشێتەوە..ئەو پەتەی ئەو ئوممەتەی لێك گرێدەداو لە سەری كۆدەبۆوە وەكو خۆی نەما ..بەڵكو هزرە دەرەكیو نامۆیەكان جێیان گرتەوە، كە لە رۆژئاوا هاورد كران ئەمەش خۆی لە خۆیدا پەرتەوازەی دەكا نەوەك كۆی بكاتەوەو.. ئوممەت بەرەو داڕزان و داڕمان دەبات..

بەڵام ئوممەت – كاتێك لەناو سەرگەردانیدابوو – پەی بەمە نەدەبردو تێی نەدەگەیشت ...

وای دەزانی –كاتێك خۆی دەزراندەوە بە جل و بەرگی نیشتمانیەتی و نەتەوایەتی – كە نوێترین جل و بەرگ ((موضە)) ی لە جیهانی هزر و سیاسەتدا لە بەركردوەو ،جلوبەرگە كۆنە داڕزاوەكەشی ,كە چەند سەدەی دوورو درێژی بەسەر دا تێپەڕیوە لە بەردەكاتەوە !

لە ڕاستیدا جلو بەرگەكە بەرەو دڕان و دارزان دەڕۆیی .. نەك لە بەرئەوەی كۆنە ! بەڵكو جل و بەرگێكە لە خۆیەوە سروشتێكی تایبەتی هەیە –

داوەاکانی لەگەڵ هەر نەوەیەکەی تازە نویٚ دەبێتەوە ، کە بەرەو دڕانو داڕزانیش دەڕۆیشت ئەو روحەی داوەکانی نۆێ دەکردەوە لە ناو دڵەکان خاو ببۆوە.

چارەسەریش ئەوە نەبوو ئوممەت جل و بەرگەکەی دابنیٚ ..بەڵکو چارەسەریەکە لەوە دابوو نوێی بکاتەوە .. ئەگەر بە تەنها عەقیدە بژی و زیندووبیٚ لە دڵەکان ئەوا خۆی لە خۆیدا داوەکانی جل و بەرگەکە نویٚ دەبێتەوە، هەروەکو،کە گەڵای دار نویٚ دەبێتەوە بەتەنها ئەگەر شیلەی زیندوو هەبێت لە ڕیشاڵەکانی ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ إبراهيم: ٢٤ - ٢٥: . نەوەی خودا چلۆن مەسەل دێنێتەوە ؟قسەیەکی بە ڕێو جیٚ بە شەنگە دارێك دەشبهیٚ ڕەگی قایم داکوتا وەو لقی لەتە شەقی ئاسمانە .بە ئیزنی راهێنەرەکەی خۆی چوار فەسلە میوەی دەبیٚ.

بەڵام ئوممەت، کە ڕوانیە جل و بەرگەکەی بەرەو پەرپووت بوون دەچیٚ ڕیزی ئەوەندە نەگرتو ئەوەندە نرخی بۆ دانەناو ڕیزی ئەو توانا سەیرەشی نەگرت ، بۆ ئەو نویٚ بوونەوەی هەیبوو ،کە خوای گەورە لەناو (الكلمة الطيبة ) دایناوبوو ،کەوشەی لا اله الا الله محمد رسول الله یە.

لەبەر خۆی کردەوەو گوێی پیٚ نەداو..لە سادەو ساکاری یان گەمژەیی خۆی حەزی چووە ئەو بەرگە زێڕ پۆشکراوەی لە ڕۆژئاوا هاورد کرابوو بە چاوێکی ڕوونیش نەیڕوانیە چنینە خراپەکەیو باشی نەپشکنی..

بەڕاستی نیشتیمان گەریەتیو نەتەوایەتی كاردانەوەیەك بوو بۆ تەنگژەیەكی ئەوروپی ڕووتو بەرهەمێكی مرۆڤایەتی نەبوو هەروەكو ئەوانەی گومانیان برد ,كە بۆ جیهانی ئیسلامیان هێنا.

بەڕاستی طوغیانی كلێسەی ئەوروپی بەدینە گۆڕاوەكەی بنچینەی هەموو بەڵایەكان بوو،كە كەوتە ناو ئەوروپا.

كاتێك طوغیان لە سنووری پێش بینكراو زیادی كرد یان بڵێ كاتێك ،كە هەست كردن بە طوغیان دزەی كردو چووە ناو دەروونی ئەوروپیەكان پاش ئاشنایەتیان لەگەڵ ئیسلام ،ئەوا هەوڵی خۆ داماڵینیان دا لە هێزو دەستەڵاتی ئەو دێوە دزێوەی ژیانیانی تێكدابوو ، سەرەتای كارەكانیان بە دورستكردنی چەند كلێسەیەك – یان چەند مەزهەبێك– دەستی پێ كرد، كە گەردەن كەچ نەبوو بۆ دەستەڵاتی پاپا ،كارەكەش بەوە كۆتایی پێهات ،كە ئەوشێوە گۆڕاوە بوو بە نەتەوایەتی و نیشتمان گەریەتی ..

لەپاشان جەنگ لە نێوانیان هەڵگیرسا ,كە نزیك بوو قەوارەو كیانی ئەوروپا تەفروتونا بكات ئەگەر– بەلای كەمی – دووكاری هاوكات پێكەوە نەبووایە ، كە هێزو جێگیربوونی دایە ئەو نەتەوایەتیانە ،كە ئەوروپیەكان وایان گومان برد ئەمە لە سروشتی نەتەوایەتیو نیشتمان گەریەتیە بۆیە زیاتر دەستیان پێوەگرت , هەتا بەو دواییە زانیان كە چەند خراپەی شاراوەی تێدایە ،بۆیە هەوڵیاندا كۆببنەوە لەژێر چەند ئاڵایەكی نویێ بۆ ئەوەی بەربەستی نەتەوایەتی و نیشتمان گەریەتی تێكبداتو لە یەكگرتنەكی گشت گیردا [1] ئەوروپا كۆبكاتەوە.

(1) دوایین هەوڵ و كۆششیان دانانی بازاڕە ئەوروپیە هاوبەشەكان بوو.

هەرچی ئەو دووکارەشە ,کە ماوەیەك – هێزو وزەی بەخشیە نەتەوایەتیەکان ئەوا – یەکەمیان شۆرشی پیشەسازی بوو دووەمیشیان لاوازی و بێهێزی جیهانی ئیسلامی بوو!

یەکەمیان هەموو نەتەوەیەکی بزواند بۆ کێبرکێ کردنی یەکتری بەو هێزە ئابووریەی لەپیشەسازیەوە هەبوو،دووەمیان وای لە نەتەوایتیە ئەوروپیەکان کرد جارێ دەست هەڵبگرێ لە کوشتنی یەکتریو، ڕووبکاتە داگیرکردنی جیهانی ئیسلامی و خێرو خێراتی بە تالآن ببات ...

لە ئیشەکانی داگیرکاری خاچ پەرست بۆ جیهانی ئیسلامی ئەوە بوو ،کە بیکاتە چەند پارویێکی بچووك بچووك بۆ ئەوەی بتوانێ قووتی بدات ,ئوممەتیش – کاتێك لە ناو سەرگەردانی بوو– بۆیان ڕازاندەوە ،کە جل و بەرگە خاوەن چینە تایبەتەکەی فرێ بداتو، خۆی برازێنێتەوە بەو بەرگەی ،کە خاوەن چنینەکی خراپەو، ڕەنگ جوانیشە لە هەمان کاتدا ...

کاتێك ئەوەشی کرد مەبەستەکەی هاتە دی! رۆژئاوای خاچ پەرست نێچیرەکەی لف کرد، پاش ئەوەی یارمەتی دا، بۆ ئەوەی خۆی بەرەو تیکەتیکە بوون ببات!

بەتەنها کاروباری سیاسی – لە قۆناغی سەرگەردانی – ئوممەتی بەرەوە خراپەو خراپەکاری نەبرد ..

بەڵکە لابردنی شەریعەت خراپەیەکی گشتگیر بوو، هەموو ژیانی ئوممەتی گرتەوەو، هەمووشتێکی لە ژیاندا گەندەڵ وخراپ کرد...

یەکەم جار لەوەوە دەستی پێکرد، کە عەقیدەو بیروبۆچوونی خەڵکیان خراپ کرد لە ئاست دیندا .

دین – هەروەکو لەلایان خواوە هاتۆتە خوار– عەقیدەیەو دروشمەو شەریعەتەو ..دینو دەوڵەتەو .. بەرنامەی ژیانە(1).

بەڵام خەڵکی – لەناو سەرگەردانی– ئەو بیرو بۆچوونە ڕوونەیان ونکردو، لەباتی ئەمە چەمکی ڕۆژئاوای کەنیسەیان نۆش کرد ،کە دین لە دەوڵەت دەپچڕێنیو، وا دین نیشان دەدات ،کە پەیوەندیەکی نێوان خواو بەندەیەو جێگاکەشی دڵەو هیچ پەیوەندیەکی بە واقعیی ژیان نیە !

ئەو هەستەیان ون کرد کە لە وتەی خوای گەورەدایە ,کە دەفەرموێ ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء: ٦٥ بەڵام نەخێر سوێندەکە بە پەروەندەی تۆ ئەمانە نابنە خاوەنی بڕوا مەگین وەختێ لە کێشەو هەرای خۆیانا بتکەنە قازی و لە دڵەوە بەهەرفەرمانێ تۆبیدەی ڕەدایان بێ و بە تەواوی مل کەچی بن.

هەروەها ئەم فەرمودەیەی خواش ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ المائدة: ٤٤ هەرکەسێك پێچوانەی فەرمانی خوا فەرمان بدات دژی خودا ڕاوەستا لە دینی ڕاست وەرگەراوە ).

هەروەها ئەم فەرمایشتەش : ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ ﴿٢١﴾ ﴾ الشورى: ٢١: ئاخۆ ئەوان شتانێ وا بە شەریکی خوا دەزانن کە دینێکی وەهایان بۆ داهێنابن وخوا ئیجازەی نەدابن ؟).

---

(1) ئەگەر دەتەوێ کیتابی لا الله الا الله عقیدة و شریعة و منهاج الحیاة بخوێنەوە.

ئەوان ئەمانەیان هەموو دەخوێندەوە لە کیتابی خودا، بەڵام– لە ناو سەرگەردانی – نەدەگیشتە دڵەکانیان تەنها چەند سەدایەکی دووری بێ واتانەبێ .. ڕاستیشە ،کە چەمکی دین و چەمکی لا الە الا اللە و چەمکی پەرستن ئەمانە هەمووی لە دەروونی موسوڵمانان پێش هاتنی داگیرکاری خاچ پەرستی و دۆڕانی لەشکری موسوڵمانان لە بەرامبەریدا بەرەو داکشان چووبوو ،بەڵام داکشانەکە ڕاوەستا لە لای دواین بەربەست ،کە نەدەبوو – لە هەستی موسولمانان – پاشەکشە تیایاندا ڕووبدا ئەویش نوێژو تەحکیمی شەریعەتی خوابوو .فەرامۆشی لە هەموو شتێك دەکەنو چاو دادەگرن لە ئاست هەر سەر پێچیەك، بەڵام لە هەستیان دەمێنێ ،کە موسوڵمان هەر دەبێ نوێژ بکاو بە موسوڵمانیەتیش ، نامێنێتەوە ئەگەر واز لە نوێژ بهێنێو دەبێ تەحاکومیش بکات بۆ شەریعەتی خواو ،بەموسوڵمانیش نامێنێتەوە ئەگەر تەحاکوم بۆغەیری شەریعەتی خوابکات..

بەڵام کاتێك – لەناو سەرگەردانی دابوون – وازیان لەهەردوو کار هێنا یەکەم جار وازیان لە شەریعەتی خوا هێنا پاشان وازیان لە نوێژیش هێنا !

ئەو شتانەی ئوممەت کردی دۆڵ لێدەرو شمشاڵ ژەنەکان بە پەلە بۆیان ڕازاندەوەو لە هەنگاوی یەکەمدا پێیان وت : دەی هیچتان لەسەر نیە ئەگەر شەریعەتی خودا نەکەنە حەکەم، چونکە ئەمە مەسەلەیەکە مل کەچ دەبێ بۆ گۆڕان ! بەردەوامیش ئەگەر نوێژ بکەنو ڕۆژو بگرن ئەوا موسوڵمانن ! پاشان بۆیان ڕازاندووە – هەروەکو ,کە باس و خواسی دێ – کە نوێژو ڕۆژوو هەموو درووشمە تەعەبودیەکان واز لێبهێنن پاشان پێیان وتن : دەی چیتان لەسەرنیە بە ردەوام ئەگەر بڵێن لا الە الا اللە ئەوا ئەگەر ڕۆژوش نەگرن .. ئەوا ئێوە هەر موسوڵمانن ! !

ئوممەت لە دوولاوە کەوتە ناو ئاشووب و فیتنەوە ..لایەنی دۆڵ لێدەرو شمشاڵ ژەنەکان– بانگخوازی داگیرکاری فیکری – و لایەنی زانایە خراپ و بەدەکان، کە بەندەی سوڵتان بوون .

هەرچی دۆل لێدەرو شمشاڵ ژەن بوون ئەوا گوتیانە ئوممەت : ئێوە شەریعەتەکەی خۆتان جێ بەجێ دەکردو دورشمەکانتان ئەنجام دەداو مزگەوتەکانتان پڕ دەکرد ئەوەی بەسەرتان هات لە ئەنجامی ئەمانەوە تەنها لاوازیو دواکەوتن و خەجالەت و بوون بوو بەرامبەر رۆژئاوا ؟ ئائەوە خودی ڕۆژئاوایە حوکم بە شەریعەتە چەق بەستوەکەتان ناکات ! بەڵکو حوکم بە یاسایەکی پێشکەوتوو دەکات ،کە لەگەڵ ڕووداوەکاندا دەڕوات , ئا ئەوە وەکو ئێوە نەنوێژ دەکات ونە ڕۆژو دەگرێت ..ئەو لە کوێیە و ئێوە لە کوێنە ؟ ئەو لە تروپکە و ئێوەش لە نشێو ؟ واز لەوکۆت وزنجیرانە بهێنن ،کە ئێوەی بەستبۆوە ..ڕابن ڕابن بەرەو شارستانیەتو هێزو بەرزبوون و پێشکەوتن!

هەرچی زانایە خراپەکانیش بوون فیکری ئیرجائیان کردە عەقیدەی خۆیان ,کە دەڵێ: ئەوەی بڵێ لا اله الا الله ئەوا بڕوادارە ئەگەرچی باکردەوەیەکش لەکردەوەکانی ئیسلام ئەنجام نەدات ! ! پەروەردگارتان پەروەدگاری دڵانە ! ئەگەر دڵت بەردەوام ئاوەدان بێت بە باوەڕ خەمی هیچ شتێکت نەبی .. لەگەڵ باوەڕدا سەرپێچی کردن زەرەری نیە !

فیتنەو ئاشووب لەوێو لەوێ کۆبوونەوە ..ئوممەتیش تێ هەڵچووە ناو سەرگەردانی !

هەرچی چاك وباشەکانیش بوون ئەوا بەردەوام هەستو سۆزیان لەگەڵ ئیسلام و کتێبی خوا بوو, بەڵام دانیشتبوونو خەمیان بۆ ڕۆژانی ڕابردوویان

دەخواردو گوتیانە خۆیان : چارمان چیە ؟ بەڕاستی ڕۆژگارو زەمانە گۆڕاوە !دەرفەتیش نەماوە بۆگەڕانەوەی پێشوو!

هەرچی بەکرێ گیراوەکانیش بوون ئەوا لە خۆشیان دەستیان داوەشاند بەلەکۆڵ بونەوەی وڵاتیان لە دوژمنی گەورەکانیان ئەوانەی هەر خودی خۆیان خۆشەویستیان بۆ دەردەبڕین!

بەڵام کۆمەلێکی تر لە خەڵك بەسەر سامیەوە ڕاوەستان : ئایا مەعقولە ئەو فەرەنجیانە  کە بڵندو شارستانی و پێش کەوتوونە ئەوانەی ئێمە لەکن پێیان دادەنیشین – ئەگەر لیٚ بگەرێن لەویٚ دانیشین – ئایا مەعقولە ئەو وەسفەی لە قورئاندا هاتووە لە سەریان جیٚ بەجیٚ بیٚ: کە ئەوان خەسارەت مەندو ..گومڕان‌و ..هەر ئەوان کەڕن‌و نابیستن و کوێریشن‌و نابینن ؟!

وەی؟!

ئەدی کیٚ سەرکەوتوو ڕێنموویی کراوە ..کیٚ چاوکراوەو چاوساغەو گەیشتووە بەگەوهەری زانین و زانستی یەقین ؟!

نەخێر ! دەبیٚ قورئان وەسفی گەلەکی تر بکات ..کە پێشتر هەبوونە ..بەڵام ئێستای ڕۆژئاوا نابیٚ ئەو وەسفەی لە سەر جیٚ بەجیٚ ببیٚ!

بەهەمان شێوە ئێمەش ! ئایا ئەو وەسفانەی لە قورئان دا هاتووە لە سەرمان جیٚ بەجیٚ دەبیٚ ئەگەر لاسایی ڕۆژئاوامان کردوەو هەوڵمان داوەکو ئەو بکەین ؟

کاتێك وەکو ئەوان فێردەبین بەرز دەبینەوەو، کۆت و زنجیرەکان تێك دەشکێنین‌و ، ئافرەت ڕزگار دەکەین و، تەشریع بۆ خۆمان دادەنێین ..ئایا لەوکاتەدا دەچینە ناو حکومی نەفامی هەروەکو قورئان دەفەرمویٚ ؟!

نەخێر !نەخێر!

یان دەبێ قورئان بۆ گەلێکی دیاری کراو هاتبێتە خوارو،حوکمەکانی بەنیسبەت ئەوانەوە ڕاستو دروست بووە، چونکە لە بەر دەشتەکیاتی خۆیان خاوەن هزرێکی پێشکەوتوو بەرز نەبوون بۆ ئەوەی ژیانیانی پێ ڕێك بخەن ، قورئان بەنیسبەت ئەوان بەرزبوونەوەو پێشکەوتن بوو بەڵام بەگشتی هەرچی دینە – هەروەکو ئەوروپا دەڵێ – ئەوا ئەمڕۆ جێگای چۆل کردیە بۆ پێشکەوتنی مرۆڤ ,کە لەسەر زانست دامەزراوە ..کەواتە کاتێك ئێمە دڵناین نابێ پێچەوانەی حوکمەکانی بکەین!

* * * *

بەڕاستی شەریعەت گرێیەکی کوێرەی کۆکەروە بوو ..کاتێك هەڵوەشاوە گرێی هەموو شتێك لێك هەڵوەشایەوە..

بەسروشتی وەنەبێ گۆران کاری هەمووی لەخۆوە بووبێ ..بەڵکو کەمەکەی لە خۆوە بوو زۆرەکەشی پالپێوەنراو بوو بە تەکبیرو نەخشەکێشانی هێزی خاچ پەرستی دەسەلأتدار, سەهیۆنیەتیش چووبووە ژێر پەنای‌و لە چوار چێوەی ئەوکاری دەکردو یارمەتیدا .بەڵام ئوممەت – لە ناو سەرگەردانی – زۆر بەخێرایی گۆڕانکاری وەردەگرت جا یەکسان بوو لە خودی سەرسام بووەکان بوایە یان پاڵپێوەنراوو نەخشە کێشراو بوایە لەلایان خاچ پەرستەکان‌و سەهیۆنیکان..

هیچ بوارێك لە بوارەکانی ژیان نەما دوور بێت لەتەزووی گۆرانکاری .. ژیانی ئابوری گۆرا .

سو بەفەرمی‌و بەئاشکرایی چووە ناو ژیانی خەڵکی . بە خەڵکی وترا : چۆن ئیش بەچەمکەکانی دینە چەق بەستوەکەتان دەکەن لەمەڕ سوڕی ژیانی سەردەمیانەو پێشکەوتوانە، کە بە چالآکیەکی زیندوو ئەخولێتەوە؟! دەتانەوێ

ژیان چەق بەست بکەن لەسەر ئەو وێنەیەی ،کەسەدەکانی ناوەڕاست لەسەری بوون؟!

بەڕاستی ئابوری نویٚ بە سوو نەبیٚ بەڕێوە ناچیٚ .. نابیٚ ! چونکە هەر دەبیٚ چەند بانقێك هەبیٚ قەرز بداتەخاوەن ئیشەکان ..بانقەکانیش ئیشیان ئەوهایە .. بەبیٚ سو ئیش ناکات! چونکە دەبیٚ پارەکانی خۆی مسۆگەر بکا، کە بە قەرز دەیداتە خاوەن ئیشەکان .. چۆنە ئەگەر ئیشتان بە شەریعەتەکەتان کرد،کە سو حەرام دەکات ؟! بانقەکان لە قەرزدان دەوەستیٚو، خاوەن ئیشەکانیش ناتوانن کارەکانی خۆیان بەڕێوە ببەنو سوڕی ئابوری ڕادەوەستیٚ و ئوممەتیش بەدوا دەکەویٚو، هی دیکە بە پێشی دەکەون ، سوو شتەکی پێویستە ، پێویستیش حەرام حەلال دەکات .. لە دڵەکانتان پارێزگاری شەریعەتەکەتان بکەن .. بەڵام واقیعەکەتان لێی گەڕێن بابڕوات لەگەڵ جوولەی ژیانی زیندوودا .. یان هەر بەچەق بەستویی بمێننەوەو ، لەئەوروپاش گەڕێن با لەهەموو بوارەکان پێشتان بکەویٚ!

ئوممەتیش– لەناو سەرگەردانی– هەموو ئەو وتانەی وەرگرت و گوێی نەدایە ئەوەی ڕاستە یان هەڵەیە .. لەگەڵ ئەمری واقیعیش خۆی گونجاند.

بینینو تێگەیشتنەکی واشی نەبوو بەرپەرچی ئەو وتانە بداتەوە ، چ جای ئەوەی ئەو دەست پێش خەریە تایبەتەی هەبێت ،کە وەرگێراو بوو لە هزرو عەقیدەو هەستەکانی .. چ جای شانازی بکات بەوجێگەیەی ، کە خوا لەبەر خاتری هێنایە کایەوە بۆ ئەوەی ڕێنمایکەرو پێشەوا بێتو هەڵەو لاریٚ بوونەکان بۆ مرۆڤایەتی ڕاست کاتەوە ..

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة: ١٤٣: بەم شێوەیە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئوممەتێکی هەڵبژاردە تا ئاگاو لە مەردوم هەبێ و پێغەمبەریش چاودێریتان لێ بکات.

بەڵێ بانقەکانی ئەوان ئەوها بوو!

بانق ـ لە لای ئەوروپیەکان ـ فیکرەیەکی جولەکەیە،بە هەمان شێوە جێ بەجێکردنیشی جولەکەنە.

کاتێك شۆرشی پیشەسازی هەڵگیرسا پێویستی بەپارە هەبوو بۆ برەودانو دەوڵەمەندکردنی پرۆژەکانی, کەسیش خاوەنی ئەو پارەو پولە پێویستە نەبوو تەنها دەرەبەگەکانو جولەکە سوخۆرەکان نەبێت .. لەبەر زۆر هۆ ئاغاکان وازیان هێنا لە یارمەتی دانی بزووتنەوەی پیشەسازی ، جولەکە سووخۆرەکان پێش کەوتن بۆکرداری یارمەتی دانیو لە خۆشیان لیکیان بەدەم دا دەهاتە خوار!

بەڕاستی هەلێکی زێرینیان بۆ ڕەخسا بۆئەوەی بەئاستێکی فراوان پارەیان بە سووبدەن. ئەوان بەوماڵەی لە دەستیان بوو بەشداریان نەدەکرد لە پرۆژە پیشەسازیەکان  لە دەست پێکی شۆرشی پیشەسازی زۆربەی ئەو پیشەسازیە نوشستی دەهێناو دەدۆرا لەبەر وازهێنانی خەڵکی لەبەکار هێنانی وەبەرهێنی ئامێر ، هەروەها رێگای گواستنەوەش خۆشو فەراهەم نەبوو ، نەخشەکێشانی بازرگانیش زۆر کەم بوو ، بانگەوازیش بۆ بەرهەمەکان نەبوو , بەڵکو ئەوان پارەیان بە قەرز دەدا بەوەرگرتنی برێك سو.. یەکسانیشە قەرزار قازانج دەکا یان زەرەر، ئەوان بەو سوەی فەرزیان دەکرد لەبەرامبەر پارە بە قەرزدانەکە دوور بوون لە زەرەر .. هەتا ئەو پارەو پولەش هەمووی ماڵی خۆیان نەبوو ! زۆربەی سپاردە بوو ،کە  خەڵکی لە ئەوروپا ڕاهاتبون بە سپاردە لەلای جوولەکەکان

دایبنێن . بەم شێوەیە فیکری بانق لەدایك بوو، کە سپاردە وەردەگرێ لە خاوەنەکانی و بەقەرز دەیداتە قەرزاران لە بەرامبەر سوێك ،کە فەرزی دەکردە سەریانو، هەندێك لە قازانجی سوەکەشی دەدا خاوەن سپاردەکان لەسەر سپاردەکەی ، بانقیش ،کە خاوەنەکانی جوولەکە بوون قازانجەکەی تری هەموو دەبرد ,کە قازانجێکی بێ بەرامبەر بوو ، یانی ماڵێکی حەرام بوو خوا حەلالی نەکردبوو .

﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾ ﴾

البقرة: ٢٧٥ - ٢٧٦: ئەو کەسانەی سو دەخۆن ، ڕاست بوونەوەیان لەو دونیا وەك ڕاپەرینی کەسێکی شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ وەهایە ، هەر چونکە ئەمانە ئێژن : فرۆشتن وەك سوو وایە . خودا فرۆشتنی ڕەوا دیوەو سووی پێ نارەوایە ، سا هەر کەسێ ئامۆژگاری خودا دەبیەو دەس هەڵدەگرێ لەوشانەی لەمەو بەر دەستی داوەتێ دەبەخشرێ وخودا بە کاری ڕادەگا . هەرکەسێکیش دیسان بچێتەوە سەری ، دەبن بەیاری ئاگرو تا هەتاهەرتیادەبن ، خودا پیتی سوو هەر کەم دەکاتەوە و پیتی خێرات پرتردەکات ، خودا ئەوانەی خۆش ناوێت کە پێ نەزان و گوناهبارن.

کە وایان لە خەڵکی گەیاند ئابوری نوێ بەبێ سوو سودی نیە ئەوا بوختانەکی جوولوکەکان بوو ، جوولەکەکان دورستیان کردو برەویان پێدا بۆ مسۆگەر کردنی زاڵ بونی بەردەوامیان لەسەر جیهانی ئابوری ، ئەوانەی

لەرێگایەوە زاڵ دەبن بەسەر ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیو هزری ئومەمیەکانو ، هەر بەو رێگایەوەش دەیان کەن بە گوێ درێژ لە حیسابی تایبەتی خۆیان , هۆشمەندەکانی رۆژئاوا بەخۆیان ئێستا بەچاوی خۆیان نەگبەتیەکانی سو دەبینن‌و لەباتی بیر لە چارەکیتر دەکەنەوە .

بەڵام ئوممەتی ئیسلامی ـ کاتێك لەناو سەرگەردانی بوو ـ غیرەتی ئەەی نەدەکرد هەتا لە ناو جێگاکەی خۆی ، قسە لەگەڵ خۆی بکاتو بڵێ دەکرێ رۆژئاوا هەڵە بکات ! بەڵکو ئەو کەسە بە هەڵ داچووە ، کەسەرپێچی رۆژئاوا دەکات, بەپێچەوانەشەوە دەبێ هەلوێستەکەشی ڕاست بکاتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەمری واقیعدا بگونجێ, یان لەگەڵ ڕای گشتی جیهانی یان لەگەڵ پێداویستیەکانی ژیانی نوێ  یان لەگەڵ هەر ناوو نیشانێك ,کە ناویان نابوو!

موفتیش هەڵسا بەحەلال کردنی سوی سادە بەبیانۆی ، کە  ئەوەی حەرامە  زۆر زۆرەکەیەتی نەك بنچینەی سوەکە خۆی! جگە لەویش هەندێکی تریش هەڵسان بەحەلال کردنی سوی سەنەدات کە وڵات دەینارده دەرەوە  بە بیانوی ئەوەی لەسەر تاکەکان جێ بەجێ دەبێ لەسەر وڵات جێ بەجێ نابێت !! هەڵسان جگە لەوی ولەوی .. هەندێکیش لەناو سەرگەردانی هەڵسان بانگەشەکردنی ئاشکرا بۆ لابردنی شەریعەت لەبەر خاتری پێشکەوتنی ئابوری کە بەرژەوەندی  گەلانی پێ دێتە دی !

ژیانی کۆمەلایەتیش گۆرا ...

وای لێهات خێزانی گەورە بووە عەیبو ڕۆشنبیرەکان ئەوەی شارەزای بوون‌و خوێندیانەوە لە ژیانی رۆژئاوادا ئەوەبوو ،کە خێزانی گەورە ,کە ئەجدادو ئەحفادو لەتەك ئەوانەشەوە باوك وکورەکان دەگرێتەوە ،ئەوە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی کۆمەڵگای کشتوکاڵی ،کە بەردەوام بە کۆمەڵگایەکی دواکەوتو وەسف

دەکرێ ـ بەڵام کۆمەڵگای پیشەسازی ـ کە بەردەوام بە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتو وەسف دەکرێ ئەوا خێزانی گەورەی لەناودا تواوەو خێزانیش تیایدا کورت هەڵبڕا لەباوك و دایك و منداڵەکان .. هەتا منداڵەکانیش تا تەمەنێکی دیاری کراو پاشان لە دایك و باوکیان جوێ دەبوونەوەو ، ژیانێکی تایبەت بۆخۆیان دادەمەزراند ، ئەگەر چی با زەواجیشیان نەکردباو خێزانیان پێك نەهێنابا .. ئەوا شتێکی ترە ! بەڵکو ئەوەی گرنگە سەربەخۆیی ئابوریە،کە پاشان سانا دەبێت لە دایك و باوکیان داببڕێن!

وای لە پێشکەوتنەی !!

ئەگەر بێتو ئێمە بەهەستو سۆزی رۆژهەڵاتیانەی خۆمان بەرگەی ئەوجەمە گەورەیە نەگرین لە پێشکەوتنی شارستانی ، ئەوە با ئەجدادو ئەحفاد لە جوغزی خێزاندا دەربێنین .. با خێزان بەردەوام لە دایك و باوك و منداڵەکان پێك بێت هەتا زەواج دەکەنو خێزانی تایبەت بۆخۆیان دروست دەکەن ، با خێزانی گەورە بۆ دێهات نشینەکان بەجێ بهێڵین ، بەحوکمی ئەوەی کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵی دواکەوتووەو پێش بینی ناکرێ لەم زوانە شارستانی بێ !

سەبارەت بە بەسترەکانی خێزانیش، کە سەرچاوەکەی تەعالیمی دین بوو بەمیرات مابۆوە ,ئەوا کاتی هاتووە بۆ ئەوەی بگۆردرێ ، چونکە دین لەم سەدەدا سەرچاوەی ئاراستە کردن نیە ، بەڵکو پەیوەندیە ئابوریەکان تەوەرەی ژیانی نوێیە (( بێژەر بەشانازیەوە ئەم وتەیەی دەگوت بەوەی هەندێك لە (نوێ خوازی) بەرکەوتووە ئەگەر بەدەست لێدانێکی دوریش بێت !))

وای لێهات هەرئەو بریاری پەیوەندیەکانی دەدا بۆ خەڵکی[1] ,ئەگەر لەگەڵ تەعالیمی دینیش تێك گیرابان ، ئەوا دەبێ تەعالیمی دین لابردرێ . . چونکە لە بارو دۆخێکی تر دابەزیوەو بۆ گەلێکی تر هاتووەو دەرفەتی پێنادرێ لەو جیهانە پێشکەوتو نوێیەی ئێمە...

پەیوەندی خەڵکی بەماڵەوە هەڵوەشایەوە ..

بەڕاستی ماڵی موسوڵمان کۆمەڵگایەکی بچوك بوو ، بچوکەکان تیایدا پەروەردە دەبوونو پەیوەست دەبون بەگەورەکانو ، پەیوەندی لە نێوانیاندا پەیوەندی مناڵەکان بوو بە باوکیان ، پەیوەندی بەهاو ڕەوشتو نەریتەکان بوو ، پەیوەندی هۆگریو خۆشەویستی بوو ، پەیوەندی ئۆقرەگرتنی دەروونو سۆز بوو ، کە ئەم مانایانە هەمووی لە دین وەرگیرا بوو ..

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الروم: ٢١ : هەر لە نیشانی ئەوە کە لە خۆتان ، ئاو جووتی بۆ بەرهەم هێنان ، کە پێیان بحەسێنەوەو خۆشەویستی و ئەوینی خستۆتە ناوتان ، لەمەدا بۆ کەسانێ کە بە ووردی سەرنج بدەن بەلگە زۆرن.

﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾

(1) لێرە تێبینی دەکرێ کە ئەو گوتارە گوتاری تەفسیری ماددیە بۆ مێژوو ، بەلام تەفسیری ماددی بۆ مێژوو تایبەت نیە بە فیکری شوعی هەروەکە هەندێك وا گومان دەبەن ، بەلکو ئەمە فیکری هەموو ئەوروپایە لە سەدە نوێیەکەی بەکارتێکردنی جوولەکە تیایاندا .

﴿وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ﴿٢٤﴾﴾ الإسراء: ٢٣ ـ ٢

پەروەرێنت فەمانی دا غەیرەز وی مەپەرستن سەبارەت بەدای وبابیش چاکە بکەن هەرگا یەکیان یان هەردووکیان لەلای تۆن توشی تەمەنی پیری بوون هەرگیز ئۆفیشیان پێ مەڵێ و تێیان مەخورەو بە زمانی خۆشیان بدوێنە بەبێ فیزی بیانخە ژێر باڵی بەزەیی و بێژە ئەی پەروەرندەی من وەکو ئەوان منیان بەشلکی پێگەیاند تۆش وەبەر بەزەیی خۆتیانخە.

بەڵام بارو دۆخەکان گۆرا..

وای لێ هات ـ لەدەرەوە ـ چەند کێش کەرێك هەبوون خەڵکیان ڕادەکێشا بۆ دەرەوەی ماڵ .. قاوەخانەکان ..خەڵکی تیایاندا دەماوە هەتا نیوەی شەو یاریان بە زار دەکرد ، یاریان بە قومار دەکرد ، یان شیشەیان دەخواردەوە ، یان چەنەبازیان لە چەندین گفتوگۆ دەکرد، کە جێگاکەی ئەوماڵانە بوو ،کە سەردانی یەکتریان تیادا دەکرد ..

ئەو قاوەخانانە بەهەر شێوەیەك بێت بۆ لە خواترسەکانی ناو خەڵکی بوو!

هەرچی لەخوا نەترسەکانیش بوون ئەوا لە دەرەوەی ماڵدا شوێنێکی زۆریان هەبوو لێی دەمانەوەو ، لە پێشیان بارو مەیخانەکان هەبوون .. کە داگیرکاری خاچ پەرست پاش لادانی شەریعەت بەپەلەچەند لێدوانێکی بە فەرمی دا بۆ فرۆشتنی ئارەق و چەند شوێنێکی ڕێ پێدراوشی تەرخان کرد بۆ ئەوەی خەڵکی تیایدا ئارەق بەئاشکرا نۆش بکەن .. کەلەسەریانی نووسی ئەو

مەشروباتی روحی [1] پێشکەکەش بە گەشتەوانانی دەکات ! لەپێشیشیان شانۆکان و سەماخانە و شوێنی ڕابواردن هەبوو ..

لەبەردەمیانیشدا بەفەرمی مالّی بیّ ناموسی و بیّ ئابرویی هەبوو ، بە مۆلەتی ولاّت کراوە بوو.. ولاّتی(موسولّمان!)پاسەوانیشی هەبوو ! ،کە ئەوئافەرەتانەیان دەپاراست ,کە عەیب وعاری خۆیان دەفرۆشت هەروەکو ،کە هەلّدەستان بە پاراستنی هەر شوێنێك لە شوێنەکانی کۆمەلگا([2])..

مانەوەو بەسەر بردن لە دەرەوەی مالّ وای لێهات بووە نیشانەیەك لە نیشانەکانی کۆمەلّگای نویّ ،کە ئوممەت لەناوسەرگەردانیدا هێنایە کایەوە ، کە پەیوەندی مالّی تەقلیدی دەپچراندو ، چەند نەوەیەکیشی دروست دەکرد,کە خۆشی وەرنەدەگرت هەروەکو ،کە نەوەکانی پێشوو خۆشیان وەردەگرت لەسەر پەرشتی باوك و یەك بوونی هەستەکان و، هۆگریو ئۆقرەگرتنی دەروون ..

پاشان رۆلّی ئافرەت هات بۆ ئەوەی ئەویش لەمالّ بێتەدەرەوە ! دۆزی رزگار کردنی ئافرەت هات ...

بەڕاستی گوزەرانی ئافرەت لە بارێکی زۆر زۆر خراپ و دژوار دابوو ..

---

(1) روحی تەرجەمەیە بۆ وشەی SPIRITUAL لە زمانی ئینگلیزیدا کە بێژەیەکە ماناکەی دوانەیە ،کە یان مانای روحیەت دەگەیەنیّ یان کحولیەت ،بەلاّم وەسف کردنی ئارەق بەروحانیەت هەلّەیەکی زۆر ئاشکرایە.

(2) داوێن پیسی لەپاشان بەشێوەی فەرمی ڕەت کرایەوە ، نەك لەبەر ئەوەی هەست بەتاوان بکەن یان هەست بەشەرمەزاری بکەن لەو سوك بیّ ڕێزیەی ولاتی (موسولّمان) تێی کەوتبوو بەلّکو لەبەر ئەوەی داوێن پیسەکان پێویستیان بەئاشکراکردنی خۆیان نەماو شوێنەکانیان دیارو ئاشکرابوو!

نەفام بوو خوێندەواری نەبوو فێریاشیان نەدەکرد..بەشتی پروپوچ بڕوای هەبوو ، ئەوەی لە کۆمەڵگایەکەی ڕووی دەداو ئەوەی لەجیهان بەگشتیو ئەوەی لە چوار چێوەی داهەبوو هیچی لێنەدەزانیو ، گفتوگۆی لەگەڵ داروسێکەی لەسەر مەزارو شێخەکانو چاوزارو ئیشوکارو عفریتو جنۆکە بوو, هەروەها لەسەر نەخۆشی منداڵەکانیو ئەو چارەسەریەی کە شێخ بۆی دادەنا لە نوشتەو دوعا ..ئەو ئافرەتەی مێردەکەی تەلاقی دابووبۆئەوەی یەکێکی تر بێنێت ,کەجادووی بۆ کردبوو,رقی لە هەوێیەکەی هەستابوو..دەیویست لەلای خەسوەکەی خۆی خۆشەویست بکات..

پاشان بێ رێزو نزم کرا بوو مافەکانی پێ شێل دەکرا چ کاتێك کچ بوو لە ماڵی باوکی یان کاتێك ژن بوو لەماڵی مێردی یان تەلاقدرا بوو بێ بەش کرابوو لە منداڵەکانی .. ڕوانینی پیاویش بۆی روانینێکی نزیك ئاژەڵانە بوو ، ئەگەر لە ئاژەڵیەتیش دەربچووبا ئەوا لە چوار چێوەی زگو منداڵ بوونو شیردانو بەرێوەبردنی ماڵ بوو زیاتر لەوە نەبوو ..

ئەمەش بە هیچ شێوەیەك لە تەعالیمی ئیسلامدا نەبوو ، بەڵکو دەرچوون بوو لە تەعالیمی ئیسلام ، کە بریاری یەکسانی دەدات لە مرۆڤایەتیو لەسەر پیاوانیش فەرز دەکات ،کە دەبێ بەهەڵسوکەوتی باش مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ .

﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ ١٩٥ ﴾ آل عمران: ١٩٥ واتە : پەروەرێنتان ئاوا بە دەنگیانەوە هات ، کە من کردەی هیچ مرۆیەك لە نێر و مێ بەبێ پاداشت ناهێلمەوە ، گشت لەلای من چون یەکن.

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ النحل: ٩٧: هەرکەسێ کرداری باشەو بەباوەڕ چ نێر ،چ مێ ـ هەتا دەژ وادەکەین بەخۆشی بژی دیاریشە باشتر لەوەی واکردوویانە، ئێمە پاداشتیان دەدەینێ.

﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ ﴾ النساء: ١٢٤: هەر مرۆیەك نێر بێ یان مێ هەر هێندە خاوەن باوەرو ئاکار چاك بێ ، دەچنەوە بەهەشتەوە و بەئە ندازەی تلیشی وردیلەی ناوکە خورمایەش ناهەقیان لێ ناکرێ.

﴿ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ ﴾ النساء: ١٩ بەتەرزێکی جوان و رەوا دەگەلیاندا بجولێنەوە ئەگەر خۆشتان نەهات لێیان شتی وا هەن ئێوە حەزی لێ ناکەن و چاکەی زۆری لەخوا بۆنگۆ تێدا بێ.

﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ ۚ ﴾ البقرة: ٢٣١ واتە : ئەگەر ژن و تەلاق دان و ماوەی چاوە نۆرەکەیان برایەوە یان بەتەرزێ خودا پەسند ڕایانگرن ، یان بەرانبەر بەیاسای دین ئازادیان کەن نەکا بەقەس ئازاردانیان رایانگرن و لەهەق لادەن .

((خيركم خيركم لأهله وأنا خيركم لأهلي [1]) واتە : باشترینتان ، باشترینیانە بۆ خاو و خێزانەکەی ، منیش باشترینتانم بۆخاو وخێزانەکەم)).

(1) اخرجه الترمذي باسناد صحيح

((لا تنكح الثيب حتى تستأمر ولا تنكح البكر حتى تستأذن وأذنها صمتها [1] :
واتە : بێوەژن مارە ناکرێ هەتا پرسی پێ نەکرێ کچیش مارە ناکرێ هەتا پرسی پێ نەکرێ ، رازی بوونەکەشی بێ دەنگیەکەیەتی))

لەم فەرموودەیەکی تریشدا دەفەرمووێ (( إنما النساء شقائق الرجال واتە : ئافرەتان تەواوکەری پیاوانن [2] )).

پێشتر لە سەردەمی پێغەمبەر صلـــى الله عليهوسلم ئافرەت هاوبەشی پیاو بوو لە ئیمان ، هاوکاری بوو لە بانگەواز بەشداری بوو لە جیهاد ، هاوکاری بوو لە بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی نوێ لەسەر بەهاو رێبیری ئیسلام ، ئەو هاوکاری وهاوبەشیە دروست نابێت تەنها بە مومارەسەکردنێکی تەواوی ئەو رێبیرانە نەبێ .. ،کە ئەمانە هەمووی بەرەوشتێکی پاکوخاوێن ئەنجام دەدرا ، بەخۆ پاراستن لەپیسی بە خۆپاراستن لەحەرام ، پابەند بوون بە حیجاب پابەند بوون بە فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی، کە تەنها بوون لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەدا حەرام دەکاو تێکەڵاویش بەبێ پێویستی پێبوون حەرام دەکاو ، سەفەرکردنیش بەبێ مەحرەم حەرام دەکاو ، چاو تێبرینیش حەرام دەکا ، چونکە تیرێکە لە تیرەکانی ئیبلیس ..

بەڵام کۆمەڵگای ئیسلامی کەوتبووە ناوخویەکی نەفامی لەمەر ئافرەتەوە مەگەر ئەوەی خوا بەزەیی پیاهاتبێتەوەو ،وای لێهات بەچاوێکی کەم و سوک دەیڕوانیە ئافرەتو ، تانەوتەشەری لێدەداو عەیب داری دەکرد بەوەی ،کە کاری تەنها منداڵ بوونەوهیچی تریش نا..

---

(1) اخرجه الشيخان

(2) اخرجه احمد وابوداود والترمذي

كاروبارەكە پێویستی بەو زانایە نوێخوازەبوو,كە كۆمەڵگا بەرزدەكاتەوە بۆ ئاست ئیسلامێكی هەق لەمەر دۆزی ئافرەتو هەمووكاروبارەكانی بوونەوەر..بەڵام ئوممەت كاتێك – لە ناو سەرگەردانی بوو– چارەسەریەكی تری وەرگرت ..!

ئەو چارەسەریەی وەری گرت رزگار كردنی ئافرەت بوو لەسەر ڕێگای رۆژئاوا..

پێویست ناكات دیسان دووبارەی ئەوە بكەینە ،كە لە چەند كیتابێكی تر گوتومانە لەمەر دۆزی رزگاركردنی ئافرەتداو ئەو هەنگاوانەی پێیداتێپەڕیوە هەتا گەیشتە ئەم وێنەیەی ئەمرۆ[1].. بەڵام لێرەدا باس لەوێنەی ئەو سەرگەردانیە دەكەین، كەئوممەت چووە ناویەوە كاتێك لە رێگا دووركەوتەوە .

ئافرەت لەماڵی خۆی دەرچوو ئەمەش, كە لە خودی خۆیدا ئامانجێك بوو لە ئامانجەكانی خاچ پەرستی سەهیۆنی بۆ وڵاتە ئیسلامیەكان، ، هەروەكو,كە فریودانی پیاو بۆ بەسەردنو مانەوەی لە دەرەوەی ماڵ بەهەمان شێوە ئامانجێكی نەخشە كێشراو بوو. بەڵام ئەمە تەنها هەنگاوێك بوو بۆ رێگایەكی زۆر دوورو درێژ ..

كاتێك ئافرەت ماڵی خۆی بەجێهێشتو هاتە دەر ، لەگەڵیشیدا هەموو بەهاو چەمكەكان ،كە پەیوەندی بەو هەبوو نەمانو ڕۆیشتن ، هەتادەتگوت ئەمە لە بنچینەی ئەودینە هەر نیە ،كە خواو پێغەمبەرەكەی فەرمانیان پێ كردووە ،كە ناكرێ بگۆردرێ، چونكە گۆرینی خراپەو خراپەكاریەكی زۆر لەسەر زەوی دەنێتەوە..

**ژیان هەموو بووە گۆرانكـاری..**

---

(1) ئەگەر دەتەوێ سەیری كیتابی واقعنا المعاصر و معركة التقالید بكە .

ئافرەت حیجابەکەی فرێداو لە خۆی داماڵی ، کە بنچینەیەکی ئەودینەبوو خواو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پێکردبوو.

پلە بەپلە دەستی کرد بە ڕووت کردنەوەی لەشی ، بە نیمچە ڕووتی دەچووە سەر کەنارەکانی دەریا .. ،کە ئەمانە هەمووی خواو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردبوو ..

کاتێکیش دەرچوو رێیدا بەخۆی ئەوەی دەیەوێ لە لەشی بەدیاری بێخی ، فیتنە دەستی پێکرد .. کە ئەستەمیش بوو ڕوو بدات ، هەتا باواش دابنێین ،کە لە سەرەتادا بۆ فیتنە دەرنەچوو ، بەڵام دوایی فیتنە بەساناترین رێگا ڕێگای دیتەوە بۆناو دڵیو بەهەمان شێوە دڵی پیاویش! ئا ئەوە خۆی بەرامبەر پیاو بەدەردێخی ، ئائەوە جوانیەکەی بەدیار دێخی ،کە بۆی هەیە بیبزوێنی وکاری تێبکا ، کە بەڕاستی کاریشی تێکردو بزواندی, ئافرەتیش ئەمەی باش دەزانیو ، رازیش بوو لەخۆی کاتێك بەم کارە هەڵدەستا .. بەرە بەرە بزواندنی غەریزە بوو بە ئامانج ،کە کۆگاکانی جلو بەرگ بە مۆدیلی جۆراوجۆر هەڵدەستا بەبرەودانیو ، کۆگاکانی جوان کاریش بەبۆن و سابونەکانیو ، رۆژنامەی ئافرەتیش .. ،کە ئافرەت کرایە گۆشەیەك لە ڕۆژنامەی گشتی بە وێنەو هەواڵ و تەوجیهات وتەعلیقات ، کراسێك جوانی سینگی دەردەخستو ! کراسێك جوانی پشتی دەردەخستو! یەکێکی تر چۆن سەرنجی پیاو بۆ خۆی ڕابکێشیو ! یەکێکی تر چۆن سۆزی پیاو بۆ خۆی بەدەست دێنیٚ و هتد..[1]

کاتێکیش فیتنە بووبەئامانجێکی نەخشە کێشراو گومان نەدەبرا کارەکە هەمووی لەچوارچێوەی (نظري) دابێت .. بەڵکودەباشتە حەرامەکە هەر ڕوویدا ..

(1) ئەمانە هەمووی ناونیشانی فیعلی بوونو لە رۆژنامە و گۆڤارەکان بڵاودەکرانەوە .

شتە حەرامەکەش ڕووی دا .

هەر چۆنێك بێت ئەمانە پێچەوانەی عورف ونەریت ومیراتو بەهاو ڕێبیرو ڕەوشتی کۆمەڵگا بوون ..

لێرەدا دۆل لێدەرو شمشاڵ ژەنەکان هەڵسانو پڕپاندایە نەریتەکانو میراتەکانی کۆمەڵگا ،کە حەرام حەرام دەکاو! بانگەشەشی کرد بەپێویستی حەلال کردنی ئەوشتانەی دین حەرامی کردون!

جابەراستی کۆمەڵگا هەڵوەشایەوەو ، وای لێ هات سەیری حەرامی دەکرد وای دەزانی حەلالەو ، سەیری حەرامیشی دەکرد بەچاوی بێزاریو توڕەیی! !

دۆزەکە وای لێنەهات, کە : چۆن خەڵکی غیرەتیان کرد حەرام حەلال بکەن .. بەڵکو وای لێهات ، بۆچی دین ئەو شتانە حەرام دەکات، کە پێویستەحەلال بکرێ ؟!

بەئەنقەستیش بیروڕایەکانی فرۆیدو تەعلیماتەکانی بلاوکرایەوەو ، چەند ڕۆژنامەو گۆڤاریشی بۆتەرخان کرا ، بۆئەوەی بڵێ قەدەغەکردن یەکسانیشە لەوەی سەرچاوەکەی دین بێت یان کۆمەڵگا یان سروشت ، ئەوا تووشی خەفەو ئالۆزی دەروونیو تێکدانی مێشکت دەکات .. کەواتە دەبێ قەدەغەکردنی حەرام نەمێنێ بۆئەوەی دەروونەکان هۆگرو ئۆقرەبگرن! !

کوروکچەکان لە دەست دەرچوون – کاتێك لەناو تاریکی سەرگەردانی دابوون – وایان دەزانی گەورەترین سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە ! !

ئەدی کاروباری ماڵ چیلێهاتو ..؟

کاروباری مزگەوت چیلێهات ..؟

ئەو ماڵەی گەورەکەی کۆچی کرد لێی بۆئەوەی بچێتە سەر شەقام ئینجا بۆ ئیش بێ بۆفیتنە بێ ، یا بۆ ئیشو فیتنە پێکەوە .. ئەوا چۆن ئەو ئارامیەی

تێدا دەبێ ،کە خوای گەورە کردوویەتی بە ئایەتێك لە ئایەتەکانی خۆی :﴿ ومن آياته أن خلق لكم من أنفسكم أزواجا لتسكنوا اليها : هەر لە نیشانی ئەوە کە لە خۆتان ئاو جوتی بۆ بەرهەم هێنان کە پێیان بحەسێنەوە ﴾. سورەتی روم ـ 21

چۆن سەرپەرشتی بۆمناڵ لێ دێتەدی ،کەمناڵ تیایدا پەروەردە دەبێ لەسەربەهاو ڕێبیرو هزرو عەقیدە ،کەکۆمەڵگای لەسەر بنیات دەنرێ ؟

بەڕاستی وێران کردنی ماڵ ئامانجێکی نەخشەکێشراو بوو لە لایەن پیلانگێڕی بەدونگریس، کە جوولەکەکان دایانابوو بۆ گەندەڵ کردنی ژیانی ئومەمیەکان بۆ ئەوەی لە کۆتایدا بیانکەن بە گوێ درێژ ، لە ئەوروپا هەلێکی زۆر کراوەیان دیتەوەو بەباشیش قۆستیانەوە ،کاتێك ئافرەت چووە دەرەوە بۆ ئەوەی پاروە نانێکی دەست بکەوێ پاشان دۆزی ڕزگار کردنی ئافرەتیان هێنا کایەوە بۆ ئەوەی وەدەری بنێن لەماڵەوەو وازلێهێنانی لاخۆشەویست بکەن .. خێزان پەرتەوازە بوو کۆمەڵگاش هەڵوەشایەوە .. کۆمەڵگای ئیسلامی لەگەڵ ئەو هەموو شپرزەییەی ،کە تێیدابوو ماوە بۆ ئەوەی پارێزگاری بکات لە پەیوەندیەکانی خێزانو پەیوەندیەکانی ماڵ .. ئەمەش کۆسپێك بوو لەڕێگای پیلان گێڕی جوولەکەی جیهانی بۆ گەندەڵ کردنی ئومەمیەکان لە هەموو زەویداو، پیلان گێری خاچ پەرستیش بۆ گەندەڵ کردنی کۆمەڵگای ئیسلامی بەتایبەت ، بۆ ئەوەی بۆ هەمووان زاڵ بوون و جێگیر بوون ئاسان بێتو، ئەو دوژمنەشیان لابدەن ،کەمایتەوە لەسەر زەوی ..

ئەوەی ویستیان هاتە دی .

لەناو کۆمەڵگادا ماڵ بەومانا ئیسلامیە نەماو.. ئەو باوەشە نەما، کەمنداڵ تیادا فێری ئیسلام دەکراو پەروەردە دەکرا لەسەر نەریتەکانیو بەهاو بیرو بۆچوونەکانی تیایاندا دەچەسپاند .. دوژمنان لە خۆشیان دەستیان داوەشاند

بەوێران بوونی ئەو پایە پتەوەی ،کە دەکرێ ئیسلام تیایدا سەر لە نوێ هەلبستێتەوە .. ئەمڕۆ ترس نیە نە لەپیاو نە لە ئافرەت نە لەمندالّ ..

مزگەوتیش چۆل کرا ..

ئەو مزگەوتەی بەردەوام مەڵبەندی تیشکدانەوەبوو لەژیانی موسوڵمانانداا..

هێمایەك بوو بۆ هەموو خێر و بێرێك ..

لەناوی یادی خوا دەکراو نوێژەکانی تیادا ئەنجام دەدراو ، خەڵکی تیایدا فێرە زانست دەبوون و تیایدا لەسەر بەهای ئیسلامی پەروەردە دەبوون .. لەوێ جیهاد دەستی پێدەکرد ، لەوێ کاروبارەکان دەبڕانەوەو نەخشەیان بۆ دەکێشرا . مــالّ لانەی بچوکەکان بوو ، مزگەوتیش لانەی گەورەکان بوو ، ئەم دوو دەزگایە پێکەوە یارمەتی یەکتریان دەدا بۆ دامەزراندنی خانوەکە لەسەرچەند بنچینەیەکی قایم .. مالّ بەمانای ئیسلامی ڕوخێنرا ، مزگەوتیش چۆل کرا ، ئەو دوو لایەنە ڕووخان ،کەخەڵکی تیایدا لەسەر ئیسلام پەروەردە دەبوون .. لێرەدا بەخەڵکیان وت دەی هیچتان لەسەر نیە ! ئێوە هەر موسوڵمانن مادام دەلێن لاإله إلا الله ! !

سەرگەردانی ئەو ئوممەتە هەتا ئەو سنورە ڕانەوەستا ..

سەرگەردانی لەجیهانی هزردا بەرفراوان بوو تا ئەو پەری ڕادەی.

بەڕاستی ڕۆشنبیرەکان خۆیان هاوێشتە سەر هزری ڕۆژئاواو، پاشان وەریان گێرایە سەر زمانی عەرەبی جایەکسانە ئەگەر دایانە پالّ خاوەنە ئەسلیەکانی ـ ئەگەر دەست پاك بانە– یان دایانە پالّ خۆیانو بە درۆو ساختە شانازیان پێوە دەکرد ـ ئەگەر دەست پاك نەبانە ـ ئەوانەش زۆربوون!

بەڕاستی لە هزری ڕۆژئاوا چەند مەسەلەیەك هەبوو شایەن بوون بۆ ئەوەی هەڵوەستەی لەلادا بکرێ .. چەند مەسەلەیەك لەسەر مرۆڤ و ئامانج لە بوونیداو ، پەیوەندی تاك بەتاك و تاك بە کۆمەڵگاو ، مرۆڤ بە سروشتو .. مرۆڤ بەخوا

.گەندەڵ ترین شت ،کە لەو هزرە دابوو باسکردنی بوو لەمەڕ مرۆڤ و خوادا .. ،کە بارودۆخە تیایدا سەد دەرسەد سەراوژێر بوو ، ئەویش بەخواکردنی مرۆڤ و ڕەتکردنەوەی خوایەتی خوابوو.

لێرەدا ڕووناچین لەو هۆکارانەی وای لە ئەوروپا کرد ،کە ئەوها لاریَ ببیَ لەو مەسەلەیە چونکە بەتایبەت ، لە جێگای تردا باسمان لێوە کردووە[1].. بەڵکو ئێمە تەنها باس لەوە دەکەین، کە هزری ئیسلامی بەدوای هزری ڕۆژئاوا کەوت لە هەموو لاریَ بووەکانیو ، بەهەمان شێوە هیچ شتێکیش ڕێی لێنەگرت لە ڕووچوون لەو لاریَ بونانەی ڕۆژئاوا لەمەر مەسەلەی مرۆڤ و خوادا [2]. ئەمەش لەچەند لایەنێك دابوو..

لەنێوان ئەم لایەنانەدا ـ لەپێشەکی دا ـ مەسەلەی تەشریع بوو..

مافی تەشریع بۆ کیَ یە؟ بۆ خوایە یان بۆ مرۆڤ ؟

ڕوون و ئاشکرا بوو, کە ئیسلام بڕیار دەدا مافی تەشریع تەنها بۆ خودایەو بەبیَ ئەوەی هاوەڵێکی تری لەگەڵ دا بێت ﴿ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف:(٥٤) ئافراندن و ڕاگەیشتن هەر بۆئەوە.

﴿ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ﴿٤٠﴾ ﴾ یوسف: ٤٠ : فەرمان هەر هی خودایە.

(1) ئەگەر دەتەویَ سەیری کیتابی رؤية إسلاميه لأحوال العالم المعاصر بکە.

(2) لەو کیتابە باشانەی لەم بارەیەوە کیتابی دکتۆر محمد البهی الفكر السلامی الحديث وصلته بالاستعمار الغربی چاپی قاهیرە.

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا نَأْتِي ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَاۚ وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦۚ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٤١﴾ ﴾ الرعد: ٤١: واته: فەرمان ڕەوا هەر خودایەو کەس ناتوانێ دەس درکاری خوا بدا.

هەردووکیان پێکەوە چ لەکارو باری گەردون چ لە کاروباری تەشریع .

﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾ المائدة: ٥٠ واته : ئاخۆ ئەوان گەرەکیان نەدابێ زەمانێ نەزانی بەر لە ئیسلام بژیەننەوە !

دەیساڵەلای ئەوکەسانەی وا لەبواری خۆیاناهیچ شك وگومانیان نیە کامە فەرمان لە فەرمانی خواچاترە.

﴿ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ﴿١٠﴾ ﴾ الشورى: ١٠ واته : لەهەرچی پێك نەهاتن خودا بەناوتان ڕادەگا.

بەهەمان شێوەش ڕوونو ئاشکرا بوو، کە ئەوروپا – بەگوتار وڕەفتار– بریار دەدا ، کە خودا هیچ پەیوەندی بە تەشریعەوە نیە ، بەڵکو مافی تەشریع دراوەتە مرۆڤ.

ئوممەت سورێکی لەناو سەرگەردانی لەچوار چێوەی خۆی لێداو یەکێك لە نێویدا وتی: بەڕاستی ئیسلام پەیوەندی بەسستمی حوکمدا نیە ! پێغەمبەر صلـــی الله علیەوسلم حاکم نەبووە ، بەڵکو قازی بووەو قەزاوەتی لە نێوان خەڵکدا کردووە ! خیلافەتیش سیستمی حوکمی نەبووە !

دیسان سورێکی تری لەناو سەرگەردانی لێداو یەکێك لەنێویدا وتـــی : بەڕاســتی ئەو شەریعەتەی پێش چەنــد سەدەیەکی دوورو درێژ دابەزی بەکەڵکی ئەوە نایەت ئەمرۆ لەو جیهانە پێشکەوتووەدا حوکمی ژیانی مرۆڤایەتی بکات،

هیچ ڕووی وێك چونیش نیە لەنێوان ئەمەو ئەوجیهانەی، کە ئەو شەریعەتەی تێدا دابەزی لەوماوە دوورو درێژەدا!!

سورێکی تری لەناوسەرگەردانی لێداو یەکێك لە نێویدا وتی: بەڕاستی ئیسلام سیستەمەکی دیکتاتۆریەو ، ستەم دەکاو،ئوممەت فەرامۆش دەکا ،کە لەم سەردەمەدا سەرچاوەی دەسەڵاتە..

ئەگەر مشتومڕ بەرپاکرا دەربارەی مافی خوا لە تەشریع دانان وحەلالکردن وحەرام کردن – ئەمەش بەپەرینەوەی لە ئەوروپا– ، ئەوا بەهەمان شێوە بەرپاکرا دەربارەی مافی خوا لە بڕیاردانی بەهاکانو بڕیاردانی پێوانەکان.

کێیە بڕیاری ئەو بەهایانە دەدات،کە حوکمی ژیانی مرۆڤ دەکات؟ خوا یان مرۆڤ ؟

هەرچی ئیسلامە ئەوا بەئاشکرایی بڕیاردەدا ،کە هەرخودایە بڕیاری بەهاکان دەدا هەروەکو،کە، بڕیاری تەشریعەکان دەدا ،چونکە هەر ئەو بەدیهێنەرو هەڵسورێنەرو رزق دەرە ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ ٥٤﴾ الأعراف: ٥٤ : ئافراندن و راگەییشتن هەر بۆ ئەوە.

﴿هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ٣﴾ فاطر: ٣: ئاخۆ غەیرە خودا ، وەدی هێنەرەك هەیە کە لە ئەزمان و زەمینا بژێوی ئێوە دابین بکات.

بەڵام ئەوروپا لە خوایەتی خوا هەڵگەڕاوەو ، لە جیاتی مرۆڤی کردە خواو ، وتی: بەڕاستی مرۆڤ هەرخۆی بریاری بەهاکانی دەدا، چونکە زاناترە بە واقیعەکەیو زاناترە بە بەرژەوەندیەکەی خۆی!!

یەکێکیان کتێبێکی نووسی بەناوی الانسان یقوم وحده مرۆڤ بەتەنیا رادەوەستێ Man StandsAlone

یانی دوور لە ئامۆژگار خوا ، یەکێکی تریش کتێبێکی نووسی و ناوی نا الانسان یصنع نفسه مرۆڤ خۆی دروست دەکا (Mam Makes Himself یانی دوور لە تەعالیمی خوا.

ئەوروپا بارودۆخی تایبەت بەخۆی هەبووە,کەوای لێکرد ئەو هەلوێستە هەلگەڕایەوە بنوێنیّ لەسەر خوا ،کە بارودۆخێکە ڕاڤە دەکرێت، بەڵام بیانوی بۆ نابینرێتەوە،چونکە بەهیچ شێوەیەك هیچ شتێك نابێتە بیانوی ئەوەی کوفر بەخوابکریّ.

بەڵام ئوممەت – لەناو سەرگەردانی– بەڕاستی ودروستی لە مەسەلەکە نەگەیشتو وا گومانی برد، کەلە بەلگەو نیشانەکانی پێشکەوتنە مرۆڤ بەخۆی بەها بۆ خۆی دابرێژیّو پێوانەکانی دیاری بکات ! ئایا خوا عەقلی بە مرۆڤ نەبەخشیوە بۆ ئەوەی بیری پیّ بکاتەوە؟ ئا ئەوە ئەو مرۆڤەیە بە یارمەتی خوازی بەروبوومی زانست و بەروبوومی ئەزموون کار بەعەقلەکەی خۆی دەکا بۆ ئەوەی ڕێبازی ژیانی خۆی پیّ دانێت، ..باشە چ مرۆڤێکە ئەو شتانە دروست دەکات ؟! ئەو مرۆڤە مرۆڤێکی بەهێزو پێگیروخاوەن بیرکردنەوەیەکی قوڵە ، کە زاڵ دەبیّ بەسەر هەموو زەوی ، ئەوەیە ،کە ئێمە بە گاگۆلە لەدوای دەڕۆین بەڵام ئەو ڕێگا ڕادەماڵیّو دەبڕیّ!

ئوممەت پەی بە ڕووەکانی کەموکوری ئەو مەسەلەیە نەبرد .

یەکەم ئوممەت پەی بەلایەنەکانی ئەوکارانە نەبرد,کە لە عەقلی مرۆڤدا داواکراوە،کە خوای گەورە وەکو نیعمەتێك بەخشیوەتی بەمرۆڤو هەر بەویش بەرزی کردۆتەوە لەسەر هەموو دروست کراوەکانی ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلٗا ٧٠

﴾ الإسراء: ٧٠ ئێمە رێزمان لە تۆرمەی ئادەم گرتولە وشکانی وزەمیندداهەلمان گرتن، رۆزی پاکژمان پێداون،لە چاو زۆر کردەی خۆمان زۆر پتر قەدرمان گرتوون.

بەڕاستی لایەنی یەکەمو هەرەگەورەی ئەوعەقلە ئەمەیە،کە رێنموییی بکات بۆ یەکتاپەرستی خودای پاکو بەرز، پاشان بەبێ هاوەڵ دانان بۆی بیپەرستێ,چونکە مرۆڤ بە فریشکی خۆی بەندەیە..لەو شالاوە دروست کراوەو بێ بڕوایە گەرێ ,کە شەیتان بەتایبەتی لەو سەدەیە برەوی پێدا لە زەوی، کە لە خودی خۆیەوە شیتاڵ شیتاڵ بوو کاتێك شیوعیەت پارێزەری بێ باوەری ڕووخاو تەفروتونابوو– خەڵکە هیدایەت دراوەکان وگومرابووەکان– بەپەلە گەڕانەوە بۆمزگەوتەکانو کلێسەکانو پەرستگاکانیان ،کەدەتگووت هەرگیز رۆژێك بێ بڕوا نەبووینە ! !

مرۆڤ بە فریشکی خۆی بەندەیە.. جیاوازیش لە نێوان ئەو بەندەو بەندەیەکی تر ئەوەیە ،کە یەکێکیان خودای هەق دەپەرستێو لەپەرستنی هاوەڵی بۆدانانێ ، ئەوەی تریانیش خوای تر جگە لە (الله) دەپەرستێ ، ڕوانینیشی بۆخوا لەسەر حەقیقەتی خۆی نیە، یان هەواو هەوەستی دەپەرستێ! !

﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴿٢٣﴾ ﴾ الجاثية: ٢٣ ئاخۆ تۆ ئەو کەسەت دیوە کە ئارەزووی خۆی دەپەرست.

ئەرکی هەرە گەورە بۆ ئەو عەقلەی خوا بەخشیوەتی بە مۆرڤ ئەوەیە ،کە لەدوای ئەم مەسەلە بنچینەیە بگەرێ، کە چارەنووسی مرۆڤی لە دونیاو ئاخیرەتدا

دەوەستێتە سەر ﴿ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ﴾ النمل: ٦٠: ئاخۆ هیچ پەرستراوێك لەگەڵ خودا هەیە ؟!

هەرچی لە ئاخیرەتدا ئەوا مانەوە لە بەهەشت یان مانەوە لە ئاگری دادەوەستێتە سەر..

هەرچی لە دونیاشە ئەوە وەڵامدانەوەی زۆر پرسیاری دەوەستێتە سەر، ئەو پەرستراوە کێیە، کە پێویستە بپەرسترێ ؟ یاسادانەر(مشرع) کێیە ،کەمافی حەلال کردنو حەرام کردنی هەیە؟ کێ بڕیاردەرەو بڕیاری رێبازی ژیان دەدا ؟ سەرچاوەی وەرگرتن (مصدر التلقی) لەمەسەلە گەورەکانی ژیاندا چنە ؟ ئەمە چ جای وەڵامی ئەو پرسیارانەی ،کە بەلای فریشکدا دەهاتوو دەچوو پێویستی بەوەڵام دانەوە هەبوو ، ئەگەر وەڵامی ڕاستی دەست نەکەوتبا مرۆڤەکەی سەرگەردانو بەدبەخت دەکرد ، لەکوێ ؟ بۆ کوێندەر؟ بۆچی؟ چۆن؟ لەکوێ هاتووینە؟ لەپاش مردن بۆ کوێ دەرۆین؟ بۆچ شتێك دەژین؟ چۆنو لەسەر چ رێبازێك دەژین ؟

ئەگەر فریشك وەڵامی تەواو ڕاستی نەدرابایەوە ئەواسەری خۆی هەڵدەگرت بۆ ناو گومرایی وەکو گومڕایی شاعیری نەفامی سەردەم إیلیا أبو ماضی ،کە دەلێت :

جئت .. لاأعلم من أین ! ولکن أتیت

هــاتم .. نازانم لەکوێ ! بەلاّم هــاتم !

ولقد أبصرت قدامی طریقاً.. فمشیت !

سەیری رێگایەکی پێشەخۆم کردو رۆیشتم !

وسأبقى ماشیا إن شئت هذا أم ابیت!

بەردەوام دەرۆم ئەگەر بمەوێ و نەمەوێ!

کیف جئت ؟ کیف أبصرت طریق؟..لست أدری!

چــۆن هــاتم ؟ چۆن رۆنیمه رێـگام ؟ .. نازانم!

لەڕاستیدا ئەمه گوزارشت له تەنگەژەیەکی نەفامی سەردەم دا دەکات .. کاتێك نەیتوانی وەڵامی تەواوی پرسیارەکانی فریشك بداتەوه ، بۆیه سەری هەڵگرت بۆ ناو تاریکایی سەرەڕای ئەو هەموو زانینەش ،کە هەیبوو!

﴿ یعلمون ظاهرا من الحیاة الدنیا وهم عن الاخرة غافلون : لەڕواڵەتی ژینی دونیا ئاگادارن و هیچ ئاگاشیان له پاشەرۆژەکه نیه .سورەتی روم ـ 7 ـ

ئەگەر– عەقلی مرۆڤ له ئەرکی یەکەمی ببایەوه– ، کە رێبازی ژیانی له دونیاو چارەنووسی لەرۆژی دوایی دەوەستا سەر – ئەوا له پێشیدا چەند ئەرکێکی تر هەبوو له پێشەکیدا ناسینی گەردوونی ماددیو تایبەتمەندیەکانی مادده بوو ، بۆ ئەوەی بەکاریان بێنێ له ئاوەدان کردنەوەی زەویدا بەگوێرەی رێبازی خوایی –، ئەمەش گۆرەپانی زانستەکان بوو جایەکسانه چ تیوریەکەی بێت یان ئەزمونیەکەی –، پاشان ناسینی سروشی خوا بوو بۆ ئەوەی له نیازو مەبەستی بگات ، بۆ ئەوەی بەگوێرەی فەرمانەکانی ئەو ژیان بەرێوه ببات ، ئەمەش بواری زانسته شەرعیەکان بوو بەوەی له نێویان دا بوو له زانستی فیقه و ئوصول و زانستەکانی قورئانو زانستەکانی فەرمووده ، پاشان ناسینی ئەو سوننەته خواییانەبوو، کە حوکمی ژیانی مرۆڤایەتی دەکات ، بۆ ئەوەی ژیانێك دابمەزرێت رێك بێت لەگەڵ ئەو سوننەته خواییانەو لانەدات له داخوازیەکانی – ئەمەش زانستی کۆمەڵایەتی بوو –، پاشان ناسینی بوو بۆ مێژووی مرۆڤایەتی ،کە لەنێویدا چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردنی مرۆڤ بوو لەگەڵ ئەو سوننەته خواییانه لەماوەی ئەو رۆژگارەی تێپەری ، بۆ ئەوەی ئێستاو داهاتووی ئەو

ئوممەتە پەندی لێ وەربگرن ،– ئەمەش زانستی مێژوو بوو – پاشان هەر زانستێك بێت ، کە سوود بە مرۆڤ بگەیەنێ لە دونیاو ئاخیرەت ..

بەڕاستی ڕووناك کردنی بەتەواوی‌و ڕاستی ئەمەیە ، کە هەڵقوڵاوە لە باوەڕبوون بە جیهانی پەنهانی‌و جیهانی هەستکراوەکان(عالم الغیب والشهادة) ،کە عەقل لە نێویدا بە ڕێنمایی خوایی کاردەکات‌و ڕێنمویی کراوەو گومراو هەڵیت و پەڵیت نابێت..

بەڵام ئوممەت لەناو سەرگەردانی پەی بەمەنەبرد.. پەی بەوەش نەبرد، کە ڕووناك کردن لەسەر ڕێبازی ڕۆژئاوا چەند هۆکارێکی ناوچەیی تایبەتی هەبوو لە ئەوروپا ، کە چەند ئەنجامێکی پڕ لە خراپەو گەندەڵی لێ کەوتەوە ..

بەڕاستی عەقلانیەتی ڕۆژئاوا کاردانەوەیەك بوو بۆ پەکخستنی کلێسە بۆ عەقل – بەلایەنی کەم – ماوەی دە سەدەی یەك لەدوایی یەکی خایاند ، ئەو سەدانەی خۆیان لە مێژووی خۆیان ناویان نابوو (سەدە تاریکەکانی ناوەڕاست) کە بەڕاستی تاریك بوون ، بەڵام نەك هۆیەکەی (دین) بێت هەروەکو ,کە ئەوروپا بیرو بۆچوونی وابوو کاتێك لە دەسەڵاتی کلێسە هەڵات ، بەڵکو بەهۆی ئەو دینە بوو ,کە ئەوروپا بەگۆڕاوی ولارێ بوویی وەریگرت, کە عەقل بەخۆوەی هەڵ نەدەگرت ، بۆیە کلێسە بڕیاری دا عەقلەکان ڕێگایان لێ بگیرێت بۆئەوەی شتە ساختەو دژیەکەکانی دەرنەکەوێ‌و وتیە خەڵکی باوەڕ بێنن‌و مشت‌و مڕمەکەن ، بەڵام کاتێك ئەوروپا ئاشنایەتی لەگەڵ موسوڵمانان پەیدا کردو تێکەڵ بەوانبوو بینی ئەوان بیر دەکەنەوەو بەروبوومی بیرکردنەوەکەشیان سەدان بەڵکو هەزاران کیتابی پڕ کردووە ، بۆیە حەزیان چووە بیر کردنەوەو کلێسەش بەسەرپێچیکەرو بیدعەچی تۆمەت باری کردن ، کاردانەوەی بەرەنگاریش بۆ سەرکێشی کلێسە فرێ دانی هەموو دین بوو ، ئیش پێکردنی عەقل بوو لە جیاتی دین‌و ، داڕمانی

ئەو شتەش بوو ،كە خۆیان ناویان نابوو(( تڕووهاتی میتافیزیقیا)) هەروایشت بەستن بوو بە هەموو ئەو شتانەی عەقل دەیووت ، جایەكسان بوو بەوەی ئایا دەچێتە ناو بازنەی عەقل بۆ ئەوەی تێی بگات یان ناچێتە ناوی ، یان دەكرێ مرۆڤ بەئارەزوی عەقلی خۆی هەڵیبژێرێ یان ناكرێ ؟

بێ گومان ئەوروپا لەلایەنی زانستەكان ڕووناك بۆوە ، كاتێك لە موسوڵمانان ڕێبازی ئەزموونی لە لێكۆلینەوەی زانستی وەرگرتو ، شتی توڕەهاتو پڕوپوچی زانستیانەی كلێسەشی فڕێدا ، كە بەناوی دین سەپاندبوویە سەریان! بەلاٌم زۆر گومڕا بوولەو شتەی ناوی نابوو زانستە مرۆڤایەتیەكان واتە ئەو زانستەی سەرچاوەكەی مرۆڤە نەوەك گوتاری دین ،كە گومڕاییەكەی گەیاندیە ئەوەی باوەڕبێنی بە ئاژەڵی مرۆڤ و ماددیەتەكەی‌و, بەهابەرزەكانیش ڕەت كاتەوەو یاسای دارستانیش (قانون الغاب) جێبەجێ بكات : كە بەتوانا بێ توانا دەخوات یان لە ڕێگادا لای دەدات ، بێ گوێ دانە ئەوەی حەلالە یان حەرامەو بێ گوێ دانە ئەوەی ئایا بەتواناكە خاوەن ڕاستیە یان خاوەنی ناڕاستی ..
بەروبوومەكەشی ئەوەیە ،كە ئەمرۆ دەبینین لە گۆرەپانی نێودەوڵەتی لە ستەم‌و دڕندایەتی ، ئەمە چ جای دڵەڕاوكێ‌و شێتی‌و خۆكوشتن‌و ئارەق‌و سەرخۆشكەرەكان‌و تاوان لە نێو كۆمەڵگای ڕووناكی! ڕۆژئاوادا!

بەڕاستی میتافیزیقی [1] لەلای ئەوان لە ڕاستی لای دابوو لای دابوولە كاركردن لە واقعی زەویدا ، نەك لەبەر ئەوەی لە خودی خۆیدا شتێكی نادیارو

(1) میتافیزیقیا : واتە : زانستی پشت مادده ( علم ماوراء المادة ) یان زانستی پشت سروشت ( علم ماوراء الطبیعة ) یانی ئەو شتانەی بە پێنج هەستەكان هەستی پێناكرێ ، بەهەستی شەشەم ( الحاسة السادسة)ش ناسراوە. وەرگێر ..

پەنهانە ، نادیاروپەنهان(غیبیات) شتێکی ڕاستە. بەڵکو لەبەر ئەوەی هزری کەنەسی لاهوتی بە بۆیەی خۆی بۆیەی کردبوو گەندەڵی کرد هەروەکو ،کە هەموو دینیشی گەندەڵ کرد, بەڵکو ڕووناك کردنەوەی ڕاستو دورست داوادەکات لەسەر رۆشنایی باوەڕ بە جیهانی پەنهانو جیهانی هستەوەر( عالم الغیب والشهادة ) بێنی، کە لێرە زانیاری تەواو کامل دەبێت و(مرۆڤ) هاوسەنگ دەبێت ، بەڵام ئەو ڕووناك کردنەوەی جیهانی هەستەوەر لە جیاتی جیهانی پەنهان دادەنێ و عەقلیش لە جیاتی دین دادەنێو کردەوە بۆ دونیا لە جیاتی کردەوە بۆ ئاخیرەت دادەنێ .. ئەوا زۆر جیاوازی نیە لەگەڵ تاریکایی یەکەم ! بەڕاستی تاوانی تاریکایی یەکەم ئەوە بوو، کە نیوەی مرۆڤی لە جیاتی نیوەکەی تری وەرگرتبوو! جیهانی پەنهانیشی لەجیاتی جیهانی هەستەوەر دانابوو دینیشی لە جیاتی عەقل دانابوو ، کردەوەشی بۆ ئاخـیرەت کردبووە بەدیل بۆ کردەوەی دونیا ، تاریکایەکەی تریش هات ،کە ناوی ڕووناك کردنەوەبوو ئەو نیوەی پێشتر فەرامۆش کرابوو دەری خستو ئەو نیوەی پێشتر بەدیار خرابوو فەرامۆشی کرد ،کە هەمان تاوانی ئەنجامدا، کە پێشتر ناحەزەکەی پێ تۆمەتبار دەکرد ، جالە هەردوو حالەتدا ستەمەکە لە قەوارەی مرۆڤ کرا .

بەڕاستی ژیان لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامی وەستابوو بەرەو تێکچوون دەرۆیی ، بەهۆی ئەونەخۆشیو لارێ بووانەی عەقیدەی داپۆشیبوو, هەروا ئەوگۆڕانکاریەی بەسەر ڕەوشتو هەڵسوکەوت داهات ئەمەش بە ڕاکردنی بەردەوام لە دا خوازیەکانی لاإله إلاالله.

کاروبارەکە پێویستی بە یەکێك هەبوو زیندوویەتیو چالاکی بگەڕێنیتەوە بۆ ئوممەت بۆ ئەوەی لەو سەرەخەوەی بە ئاگابێتەوەو سەر لە نوێ ڕاپەرین (انطلاق) بکاتەوە ..

ئەو کاروبارە پێویستی بەو زانا خواناسو، نویٚ خوازەو موجاهیدە بوو ،کە شوێنەرای فیکری ئیرجائو فیکری سۆفی دەسرێتەوەو ڕاکردنو خۆدزینەوە لەئەرکەکانو تەمبەڵیو سستی لادەباتو, زیندوویەتیو بیٚ گەردیو ئیجابیات دەگەرێنێتەوە بۆ عەقیدەی باوەڕبوون بە جیهانی پەنهانو لابردنی ئەو شتانەی پێیوە لکاوە لە پروپوچی و تەواکولی سەلبیو خۆهەڵواسین بەشتە لە ئاســـابەدەرەکان هەروەکو ،کە زیندوویەتی و بیٚ گەردی و ئیجابیات دەگەرێنێتەوە بۆ هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ جیهانی هەســـتەوەر ( عالم الشهادة)و لابردنی ئەو شتانەی پێیوە لکاوە لە تەمبەڵیو خاویو دانیشتن لەمەڕ بەکارنەهێنانی هۆیەکانو، کە بەمە ڕاپەرینەکان بە هاوسەنگیو تەواوی بۆ ئوممەت دەگەرێتەوە ،کە ، پێشتر شتی زۆرسەیرو سەمەرەی هێنا کایەوە لە بڵاو کردنەوەی عەقیدەی یەکتاپەرستی لە هەموو کونو کەلەبەرەکانی زەویو دامەزراندنی بزاڤێکی زانستی بلیمەتو ، بزاڤێکی شارستانی کەم وێنە لە مێژوو ..

بەڵام ئوممەت لەناو سەرگەردانی بۆلای نمونە شپرێوەکەی رۆژئاوا لاربۆوە ، بیٚ ئەوەی تێبگات ،کە چەند شپرزەییو پەشێوی تێدایەو لەهەمان کاتیشدا بیٚ ئەوەی تیٚ بگات ، کە ئەوەی ئەوروپای تووشی ئەم کەمو کوڕیە کرد دینە لاڕیٚ بووەکەیو کلێسە سەرکەشەکەی بوو ،کە بەدینەکەی مەغرور بووبوو ، کە قەت خاوەنی ئاینێکی ڕاست نەبووینە بۆ ئەوەی بگەرێنەوە لای بۆئەوەی رێرەوەکەی پیٚ ڕاست بکاتەوە کاتێك لە رێگا لاڕیٚ دەبیٚ ...

لەو بۆنەیەدا وتیان بەڕاستی شاڵاوی فەرەنسیەکان بۆ سەرمیسر کلیلی خێر بوو بۆیو,هەروا بۆ هەموو ئەو شوێنانەی لە دەورویشتی دا بوونو ، هەر ئەو ئەوانی وریا کردوەو ڕووناکی و جوولەی نارده ناو ئەو تاریکایە ڕاوەستاوەی ،کە هەموو جیهانی ئیسلامی پێچابۆوە !

هەرچی ،كە شالاَوی فەرەنسیە میسری بەئاگا هێنایەوە لەخەوو بزواندنی ئەوا بێ گومان ڕاستە ..بەلاَم،كـــە ڕووناكی كردەوە ئەوا كارێكە بەلایەنی كەم ئەوەیە بلێین ،كە ئەم كارە پێویستی بە پێداچوونەوەیەكی باش هەیە !

ئەگەر مرۆڤێك لەسەر ڕێگایەك دانووستبێتو سەیارەیەك بێ لێی بداو هەندێك لەجومگەكانی لێك بترازێنێتو هەندێك ئێسكی تێك بشكێنیو ملی كووڕ بكاو ، نەتوانێ ملی بجولێنێ تەنها بۆ یەك ئاڕاستەی دیاریكراو نەبێ ئایا ئەو كاتە چی بلێین ؟!

هەرچی، كە سەیارەكە بەئاگای هێنایەوەو لەجێگای خۆی بزواندنی ئەوا شتێكی جەخت كراو ڕاستە !

هەرچی ،كە ڕووناكی كردەوەو ڕێی نیشانداو ڕێنمویی كرد بۆ ڕێگای ڕاست ئەوا كارێكە پێویستی بە بەلَگە هەیە !

خاچ پەرستان چاودێریەكی خەستیان لەبەر چاوان دانابوو لە دووخالْ لە جیهانی ئیسلامی: ئەستەنبۆلْ و قاهیرە : ئەستەنبۆل چەقی خیلافەت بوو، یانی چەقی هەردوو هێزی جەنگیو سیاسی بوو ، قاهیرەش چەقی تیشك دانەوەی روحو رۆشنبیری بوو بۆ جیهانی ئیسلامی ، كە هەلْقولاَو بوو لە ئەزهەرو ئەوەی لە نێوی دابوو لە زانستی دینیو گرنگدان بە زمانی عەرەبی ، كە زمانی قورئانە ، بایەخ پێدانی خاچ پەرستەكان بەو دوو چەقە ئامانج گر بوو بۆ ڕووخانی بنچینەكانی ئیسلام تیایاندا ، جا دوایی سانا دەبێت ڕووخانی بنچینەكانی ئیسلام لە هەموو شوێنەكانی تری ئیسلامی، دەربارەی میسریش ئەوا شالاَوی فەرەنسی

بەسەرۆکایەتی ناپلیۆن سەرەتای بزواندنی خاچ پەرستی بوو بۆ لەناو بردنی ئیسلام لە چەقی تیشك دانەوەی روحیو رۆشنبیری [1].

لەنێو هۆکارەکانی شالاوەکەش پلە بە پلە هەوڵدان بوو بۆ حەلال کردنییاسای ناپلیۆن بۆ ئەوەی جێگای شەریعەتی ئیسلام بگرێتەوە ,کە لەوێنەیچەندفەرمانێك لە نهێنی سەربازی ناپلیۆن بونابرتەوە دەردەچوون لە چەند بڵاوکراوەیەکی یەك لە دوای یـــەکیشدا بڵاودەکرایەوە.

چەند هۆکارێکی تریش هەبوو هەروەکو ،کە جبرتی دەڵێ ، کە مێژووەکی بەدوورو درێژی لەسەر ئەم شالاوە دانا( شالاوە داوێن پیسەکە) ئەو ئافرەتە نزمو سوکانەبوون ،کە بەرووتی لەسەر شەقامەکان دەرۆیشتنو ئابروچوو ڕوتو رەجاڵ بوون بۆ تەفرەدانی ئافرەتە موسوڵمانەکان [2] دەربارەی مەسەلەی ڕزگارکردنی ئافرەت.

هۆکارێکی تریش بەهەمان شێوە وروژاندنی نەعرەی فیرعەونی لە رێگای پشکێنی شوێنەواری فیرعەونەکان و دەرخستنیو پەخش کردنیو گرنگی پێدانیانن .

ئەم هۆکارە خەڵکی وامەزەندەیان کرد ،کە هیچ شتێکی تێدا نیەو تەنها مەسەلەیەکی زانستی ڕووتە !

---

(1 ) لە هەمان کاتدا یان کەمێك پێش ئەوە جوولەیەکی ئاراستەکراو بۆ دەوڵەتی خیلافەت هەبوو ، بۆ گاور کردن و بەرۆژئاوا کردنی ، بگەرێوە بۆ کیتابەکانی مێژوو لەو بەشانەی باسی ماوەی حوکمی سوڵتان موڕادی سێهەمی کردووەو ئەو ئاراستەیەی هەیبوو بۆ نوێ کردنەوەی خیلافەت .

(2) سەیری بەرگی دووەم بکە لە کیتابی عجائب الآثار للجبرتي ، لاپەرەکانی ( 231 ، 244 ، 245 ، 251 ، 272 ، 273 ، 436 ، 437 ).

بەڵام ڕۆژهەڵات ناسێك بەڕاشكاوی لە كیتابی الشرق الادنی مجتمعه وثقافته[1] وتی : ئێمە چووینە ناو هەموو وڵاتێكی موسوڵمانانو زەوییەكەیمان هەڵكەند بۆ ئەوەی شارستانیەتی پێش ئیسلامی لێ دەربینین ، ئارەزوشمان لەوە نیە موسوڵمانان لە ئیسلام هەڵگەڕێنەوە بۆ عەقیدەی پێش ئیسلام ، بەڵكو كافیە بۆمان دوودڵ بێت لە خۆشەویستی نێوان ئیسلام و ئەو شارستانیانەتانە !

ئەی فیرعەونیەت چیە ؟

بێگومان فیرعەونیەت پێشكەوتنەكی زانستیوهونەریو تەكنەلۆژیایەكی دیار دەگرێتەوە ..بەڵام لەكۆتاییدا نرخی چیەو, وەسفیشی لەكیتابی خوا چیە؟

بێگومان فیرعەونیەت یەكێكە لە نەفامیەكانی مێژووی بت پەرستی لە ڕێگادەرچوو ، دوور لە ڕێنمایی خوداو شایەن بۆ غەزەبی خوا .

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴿٧﴾ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ ﴿١٢﴾ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ ﴾ الفجر: ٦ - ١٣ خۆ دیتت پەروەرندەت چی كرد بەرامبەر هۆزی عاد ، بەرەی ئیرەم خێوی خانووی ئەستونداری ( تەرزو گوشاد ) ئەو مالانەی وێنەیان لە شارانیشدا چێ نەكرابوو ، فیرعەونیش خێوە كۆشكەكانی گەورەو بلند ، ئەو كەسانە پەروەرندەی تۆ وەبەر قەمچی ئازاری دان.

ئەمە پەرستنی فیرعەونەو ، پەرستنی بتەكانە لەباتی خوا..

---

(1) سەیری كیتابی ( Near East : Culjure and Society ) بكە : جمع واشراف كویلز الترجمه العربیه من منشورات الالف كتاب بالقاهیره .

بەراستی نەفامیە، خوای گەورە لە خەڵکی میسر خۆش بوو کاتێك یەکەم جار بوون بە نەسرانی ، پاشان بە لێخۆشبوونەکی گەورەتر میهرەبانی کردن کاتێك ئیسلامیان بۆ هاتوو چوونە ناو ئیسلام .

جابۆ جارێکی ترسەر لە نوێ دەوروژێندرێتەوە ، تەنها مەگەر قسەی ئەو رۆژهەڵاتناسە نەبێت ، بۆ دوودڵی خستنە ناوخۆشەویستیو دۆستایەتیان لە نێوان ئیسلام و ئەو شارستانیەتەی پێش ئیسلام ، بۆ ئەوەی لەکۆتاییدا خلیسکاندنیان سانا بێتو دوور بکەونەوە لە ئیسلام .

بەڕاستی شاڵاوی فەرەنسی بۆ سەر میسر سەری کرداری بەرۆژئاوابوون بوو یان کرداری کاول کردنی بەئەنقەست بوو بۆ دوورکەوتنەوەی میسر لە ئیسلامو بەهەمان شێوە عروبەش ، ئەی کوا جێگای ئەو خێرو بێرانەی کە بەدرۆ وتیان رژایە سەر میسر بە هۆی شاڵاوی فەرەنسیەوە؟!

لەخەو بەئاگاهاتنەوە؟

بەڵام پاش ئەوەی ئوممەت جومگەکانی تێك شکاو لەسەرەخۆش دوور خرایەوە لە کەلەپوورو دین و ڕەوشت و نەریتەکانیو گەردەنی بۆلای رۆژئاوا سوڕاند بۆ ئەوەی غەزوی فیکری بە قولی بچێتە تەنیشتەکانیو ڕوو بچیّ لە بەدواکەوتنی بۆ رۆژئاوا بێ ئەوەی ئەندازەکەی کەس بیزانیّ..

هەرچی بە ئاگاهاتنەوەی ڕاست و دروستە ئەوا نزیك بوو بەبیّ دەست تێوەردانی شاڵاوی خاچ پەرستی بێتەکایەوە ، بەراستی بزاڤی شێخ محمد کوری عبدالوهاب مژدە دەرێکی ڕاستی بوو بۆ بە ئاگاهاتنەوەی ئوممەت لە خەوەکەی و گەڕانەوەی بۆ سەر ڕێگا بەڵام,کە سەیارەکە لە نوستوەکەی داو بە ئاگای هێنایەوە .. ئەوا بەڵیّ .. بەڵام لەرێگا دووری فرێدا.

کاتێك نەخۆشیە درمەکە لەلاێ بووەکانی ڕۆژئاوا دەپەریەوە بۆ ئەو ئوممەتەی دیژەنی لەسەرگەردانی ئەوا بەهاکان لە ژیانیدا گۆڕان ، ئەو بەهایانە نەمان ,کە خوا بڕیاری لەسەر دابوون ، کە– هەندێك کەس پابەند دەبوون پێیو ، هەندێك کەسیش لێی هەڵدەهاتن– بەڵکو ئەو بەهایانە لە جیاتیان دانران کە مرۆڤ داینا بوون

ئەگەر خوا نرخی گەورەی کردبێتە تەقوا ، ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات: ١٣ بەرێزترینتان، پارێزگارترەکانتانن. بەمانا گشت گیرەکەی بۆ تەقوا ،کە چاکەکانی هەموو مرۆڤ دەگرێتە خۆیو مۆرڤ بەرز دەکاتەوە لە هزرو هەستەکانو هەڵس کەوتی هەتا بەزترین شت ،کە بتوانی بیگاتیێ ، ئەو مرۆڤەی خۆی کردۆتە خوا لە جیاتی الله دەڵێ : نرخی هەرە گەورە هێزەو ،ئەویش کارکردنە بۆ جێگیربوونی لە ژیانی دونیا بەبێ ڕەچاوکردنی ئاخیرەت ، ئەویش لەزەت وەرگرتنە لەشتەخۆشەکانی دونیا بەبێ ڕێبیرو ڕەوشت .. بەڕاستی خەڵکی ژیان و ئەندازەی ئەو کەم وکوڕیەیان بینی ،کە لە ژیانی مرۆڤایەتی ڕوویاندا لە ئەنجامی فرێ دانی ئەو بەهایانەی خودا بڕیاری لەسەر دابونو لەگەڵ شوێن کەوتنی ئەو بەهایانەی مرۆڤ بڕیاڕی لەسەر دابوون .

بەڵام ئوممەت ـ لەناو سەرگەردانی ـ نەیتوانی مەدای ئەو کەم و کوڕیە تێ بگات ،کە لەناو ڕێبازەکەدا هەبوو، ئەوەی دەکرێ لەسەری دروست ببێ لە شوێنەواری ترسناك لە ژیانی خەڵکیدا ، ئەوە چ جای ئەوەی ،کە لەناو خەجالەتیەکەی دابوو غەزوی فیکریو سیاسیو سەربازیوئابوری خەجالەتیەکەی بۆ چەند جارە کردەوە ، کە لە دەروونی خۆیدا هێزو تواناو عەزیمەتی نەدیتەوە ، کە ڕۆژئاوا بەو شتانەوە ئەو پێش کەوتنە ماددیەی وەدەست خست ، بەڵکو بە

تەنها ڕەوشتی خراپی وەرگرتو نەی توانی لە گۆڕەپانی ماددیدا بە ڕۆژئاوا بگات ، کە پێکەوە تەقواو هێزو توانای لە دەست داو بوو بە شێوەیەکی گۆڕاوو نەیتوانی هیچ شتێك بکات!

بەهەمان شێوە پێوانەکانیش گۆڕانو تێك چوون ،کاتێك سەرچاوەکەی بووە ئارەزووبازی مرۆڤـ لە جیاتی سروشی خوایی، هەندێك کەس هەستانو وتیان پاکی پێوانە نیە بۆ باشی ! تێکەڵاوبوونو گرتنی دۆستو ، بەستنی ئەو پەیوەندیانەی دین پێی پەسندنیە پێوانە نیە بۆنەنگیو سوکی! هەروەها ئافرەت ئەوەی دەیەوێ ڕووتی بکاتەوە لە لەشی پێوانەی تێکدانی ڕەوشت نیە، یان قسەگوتن بەخوای پاكو بەرز، یان بەپێغەمبەرەکەی – صلى اللهعليه وسلم– یان بە کیتابی خوا، یان بەسوننەتی پاکی پێغەمبەر – صلى اللهعليه وسلم– لەو ڕێزو پایەی موسوڵمانان لەسەری ڕاهاتووون ، ئەواپێوانە نیە بۆ کوفر یان کزی باوەڕ! پێوانەکان هەموویان ڕێژەیین، پێونەی نەگۆڕو ڕەها هیچ بوونی نیە..ئەوشتەی ڕۆژێك لەرۆژان تەمەشا دەکرا بەوەی (فضیلة) یە ئەمرۆ بۆی هەیە( رذيلة) بێت ئەوەی تەمەشا دەکرا،کە واجبە ئەمڕۆ بەچاوێکی زۆر دوور لەواجب تەماشا دەکرێ! ئەوەی تەماشا دەکرا بەوەی ،کە هەڵەیە ئەمرۆ بۆی هەیە ڕاستیەکی تەواو بێت..!

کاتێك ئومەت لە ناوسەرگەردانی دابوونەخۆشی گۆڕانیش هاتە ناویەوە، کە ئەو گۆڕانە فکرەی نەگۆر لەهەموو شتێکدا ڕەت دەکاتەوە.. هەتا لەدین..لە بەهاکان..لەڕەوشت!

ئایاشارەزای داروین نەبوویت .. یان هیچت لەبارەی ئەو نەخوێندۆتەوە؟

داروین دەڵێ : هەموو زیندەورێك گۆڕانی بەسەرداهاتووە،گۆڕانیش دەستوری ژیانە.مرۆڤـ لەسەرەتادا لەسەرئەو وێنەیەی، کە ئێستا هەیەتی دروست

نەکراوە، بەڵکومەیونێك بووەو پاشان گۆڕانکاری بەسەر داهاتووە،کە موو هەموو لەشی داپۆشی بوو لەسەرچوار پـێان دەرۆیی..پاشان موەکان لەماوەی چەند ملیۆن ساڵدا هەڵوەرانو ئەنجا هەستاوە سەردوو پێیان،کاتێکیش سەری جێگیر بوو لەسەر لەشی نەك وەکو ئاژەڵەکانی تر هەڵواسراو بێت لەهەوا ئەوە رێگاخۆش بوو بۆمێشکی بۆئەوەی گەورەبێتو ،پاشان زیرەکی زیادی کردو زانیاری فێربوو قسەی کرد!!

چەند ڕۆژنامەیەك تەرخان کرا بۆ بڵاوکردنەوەی هزری داروینیو ،فکرەی دروستکردنی(ذاتی)ش بڵاوکرایەوە ،کە هیچ کاروفرمانی خواپەیوەندی پێوەنیەو ،سروشتیش بەخۆی هەموو شتێك دروست دەکاتو تواناشی لەسەر دروست کراوەکان بێ سنوورەو! لەهەمان کاتیشدا هیچ مەبەستێکی دیاری کراویش نیە لەپشت دروست کراوەکان!!

بەڵام ئومەت– لەناو سەرگەردانی– تێنەگەیشت کە بیردۆزی داروین ئەگەرێکی زانستی بوو زانستی دەوڵەمەندنەکرد،ئەگەرچی ناوی بیردۆزیشیان بەسەردا دابوو..هەتائەگەر بیردۆزیش بووبێت ئەوا لەوکات تاوەکو ئێستاش لە قەیدی سەلماندن دایەو بە هیچ شێوەیکیش نەگەیشتۆتە چەند ڕاستیەکی نەبڕاوە.مەسەلەی دروست کردنی(ذاتي)ش مەسەلەیەکە بە هیچ شێوەیەك بەڵگەی لەسەر نیە، نە لەلای داروین نە لەلای ئەوکەسانەی پروپاگەندەیان کرد.ڕێبیری ڕق بەرایەتیش،کە زاناکان لەڕاست کلێسە لە ئەورووپا گرتیانە بەر لەوکاتەی زاناکانیان بە زیندویی سوتاند چونکەگوتبویان زەوی وەك خڕی تۆپ وایە ،ئەوشتانە بوون وایان لە داروین کرد بیردۆزەکەی خۆی یان باشتر وایە بڵێین – ئەگەرە زانستیەکانی– بەبەرگێکی بێ باوەڕی دابپۆشێ ،کە شوێنەواری هێزو توانای خوا لە کرداری دروست کردندا ڕەت دەکاتەوە, ئەوکەسەی دروست کردن دەداتە

دەداتە پاڵ نادیارێکی پڕوپووچ،کە ناوی سروشتەلەگەڵ ئەوەی,کە ئەو بەرگە لە پێداویستەکانی بیردۆزەکەی نەبوو – ئەگەر وامان دانا ڕاست بێت !– ئەوا ئەگەر بێتو ئەو ڕق بەرایەتیە لەگەڵ کلێسە دروست نەبوابە ئەوا بەڕاستی داروین شایەن بوو بەوەی دروست کردن و گۆڕان بداتە پاڵ خوا، چونکە نامەیەکی بۆیەکێك لە هاوەڵەکانی نووسی،کە لەودوایە بڵاوکرایەوە ,کە تیایدا وتبوی: نازانم بۆچی تومەتبارم دەکەن بەبێ باوەڕی لەگەڵ ئەوەی من باوەڕم بە خوا هەیە ! !

بەهەمان شێوە ئوممەت نەیزانی ،کە شەیتانەکانی سەرزەوی بیردۆزەکەیان– یان ئەگەرە زانستیەکانیان– بەڕووبەرێکی بەرفراوان لە هەموو زەوی دا بڵاوکردەوە، بۆ ئامانجێکی دیارو ئاشکرا ، کەلە برۆتۆکۆڵەکانیان بەڕاشکاوی وتیان بەڕاستی سەرکەوتنی داروینو نیتشەمان تاوتوێ کردو لەلاشمان کاریگەری هزرەکانی لە سەر بیروباوەڕی ئومەمیەکان زۆر ڕوون وئاشکرایە [1].کاتێك سیفەتی دروستکردن بۆخوا لادەبرێو ، کاتێك مرۆڤ لەبنچینەیەکی ئاژەڵدا پێشکەوتوەو ، کاتێك لە دروستکردنی مرۆڤدا هیچ ئامانجیك نیە ،ئەی کوا بواری دین؟ کوا بواری بەها؟ کوابواری ڕەوشت؟ ..، کەئەمانە هەمووی دامەزراون لەسەر بنچینەی ئەوەی ،کەمرۆڤ بونەوەرێکەو جیایە لە جیهانی ئاژەڵدا ،گەورەترین شتیش ، کە لەو جیای دەکاتەوە هۆشیاریو مەبەستو سەربەستیە ،دووڕێگاشی لە بەردەمە نەك وەك ئاژەل یەك ڕێگا ، تواناشی هەیە هەردوو ڕێگاکە لە یەکتر جیابکاتەوەو تواناشی هەیە یەکیان هەڵبژێرێت :﴿ونفس وماسواها فالهمها فجورەها وتقواها ،قد أفلح من زكاها ، وقد خاب من دساها : بەگیانی مرۆ سوێندەکەو بەوەش ڕێکی ختسوە ، ئەوسا هەموو

---

(1 ) برۆتۆکۆلی ژمارە(1) سەیری تەرجەمە عەرەبیەکەی بکە هی محمد خلیفەالتونسیەلا113

تاوان بارێك پارێزگاری دەویژدانی گەیاندووە . دیارە هەرکێ گیانی خاوێن ڕاگرتوە ، رزگاربووە هەرکەسێکیش دەگوناهیەوە پێچاوە ، دۆراندویە ﴾ سورەتی شمس: 7–10.

بەهەمان شێوە نەخۆشی گەماڕۆدانی زانیاری لەسنوری هەست پێکراودا هاتە ناو ئەو ئوممەتە ، یان ئەومعقولەی ،کە هەست پێکراوی ئەزمونی گەواهی بۆدەدات ، یانی عەقلانیتی ئەزموونی ، کەجیهانی نادیار ڕەتدەکاتەوەو، لەجیهانی هەست پێکراویشدا فەرامۆشی ئەشتانە دەکات ، کە لە بازنەی ئەزموونی هەستپێکراودا دەردەچێ..جا هەندێك هەڵسان ڕاڤەی جنۆکەو فریشتەیان کرد بەوەی,کە لە لای مرۆڤ ڕەنگدانەوەی گیانی خێرو گیانی شەڕەو هیچ ، بوونێکی ڕاستی نیە ، هەروا ڕاڤەی موعجیزەی شەق بوونی دەریایان کرد بەگۆچانی موسا بەوەی، کە لەکاریگەری داشکان بەرزبونەوەیەو ڕاڤەی باڵندەی ئەبابیلیش بەوە کرد ،کە میکرۆبی خوریکەیە .. جگە لەوەش هەنێك هەڵسان بە ڕەتکردنەوەی قیامەت و زیندوو بوونەوەو حیساب و پاداشت ، یەکێکی تریش هەڵسا سروش و پەیامی ڕەتکردەوە ، هەندێکی تریش وتیان : ,کە قورئان باسی ابراهیم واسماعیلمان بۆ دەکات ، تەورات و ئینجیلیش بەهەمان شێوە باسمان بۆدەکەن ، بەڵام چ قورئان چ تەوراتو ئینجیلێ بوونی مێژوویی بۆهەردوکیان ناسەلمێنن! !

* * *

لەناو سەرگەردانیدا خۆمان نەناس کرد لە مێژوو سەروەریمان – لەباشترین بارودۆخ – تەماشامان کرد ،کە چەند ڕووداوێك بووینەو بەسەرچونەو ناگەڕێنەوە ..لە هەندیك باریشدا چەند ڕووداوێکن لە پەراوێزدانو لە هیڵی ڕەورەوەی مێژوودا هیچ نرخو بە هایەکی نیە ..لەهەندێك باریش چەند ڕوداوێکی ڕیسوا بووە ،

رۆشنبیری هەق و.. رزگار بووی هەق و .. سەردەمیانەی هەق لە پێوەستبوون پێیانەوە خۆیان لێدەکشاندەوە . .لەهەموو بارودۆخەکانیش چەندروداوێکی سادەبوینەو توێشووی زیندوو هەڵقوڵاوی تێدانەبووە ، هەروەکو ، کە لەڕووداوەکان و مێژووی رۆژئاوادا هەبووە ! !

بێگومان ئەوکات هەررۆژئاوا لە پەڕی ڕووداوەکاندا دیاربووەو ، هەر ئەویش بەهێزو بەدەرامەت و کارتێکەرێکی کاریگەر بووە، ئوممەتی ئیسلامیش کاتێك لە بێهێزی و ڕیسوابوون و داکشانیدابوو لە کاروبارەکانیشی پەراوێزبوو بوو لە واقیعی گیژەلووکی زیندووشدا دەست بەسەر کرابوو ، وتەی ئەم شاعیرەی لەسەرجێ بەجێ دەبوو:

ویقضی الامر حین تغیب تیم............. ولا یستاذنون وهم شهود !

بەڵێ! بەڵام ئەمە پەیوەندی بە مێژووی ڕابردوو سەروەریەکانیدا چیە ؟ ! ئایا ڕاستیەکانی مێژووی ڕابردوو ، کە جێگیرو قایمن دەگۆڕێن بە کاریگەری ئیستای دژوارو خراب ؟ ! ئایا سەروەریەکانی ئوممەتێك دەسرێتەوە بەهۆی گۆڕانی نەوەیەك لە نەوەکان؟ !

لەڕاستیدا,کە پیا هەڵگوتن بە سەروەریەکانی مێژوو لەبەرخاتری قەرەبوونەوەی دەروون لەو واقیعە بەرتەنگ کراوە دیاردەیەکی خۆشحالیە ، ئەوا زۆر جیاوازی نیە لەگەڵ ئەوەی مادده سڕکەرەکان نۆش دەکات بۆ ئەوەی ڕابکات لەدەست ئەو واقیعە دژوارەی ، کە دەستەوسانە لە گۆڕینی ، بۆیە لێی رادەکات بۆناو قوڵایی ئەندێشە ..

بەڵام کارەکە بۆی هەیە دیاردەیەکەی دروست بێت ئەگەر بەئاڕاستەیەکی تردا بروات .. بەوەی ، کە سەروەریەکانی ڕابردوو چەند ڕاستەیەکی گەواهی بۆدراوەو چوونە ناو ئەندێشە نیە ، ئەگەر – پەروەردەیەیانە – بەکارت هێنرا بۆ

هاندانی ئەو تەقەلایە تەمبەڵەو ، زیندووکردنەوەی ئەوشکۆیە بابردوانە ، ئەوە پشتیوانەکی زیندوەو بەکەڵکی ئەوە دێت چارەسەری ئەو نائومێدیەی پێ بکریت ، کە تووشی موسوڵمانان بوو لەئاکامی دۆرانی سەربازی و دۆڕانی دەروونی .
بەڵام بانگ خوازی داگیرکاری فیکری لە بۆسەدا دانیشتن بۆهەر هەوڵدانیکی لەوجۆرە هەروەکو بڵێی دەترسان لەوەی ئەو هەوڵو تەقەلایانە سەربگرێتو ، موسوڵمانان بگەڕێنەوە بۆخودی خۆیان ، کە لەسەرەتای سەرسامبووندا بەجیان هێشتبوو سەر لەنوێ دەست بکەنەوە کاروانێکی نوێ لەسەر ڕێنمایی ئەو ڕابردووە شکۆدارەی ، کە چەند سەدەیەك لەنێویدا ژیان..سەیریش لەکاروبارەکەدا ئەوەیە ، کە ئەوهەوڵێستەی بەم دوایەیان لە خودی خۆیانەوە نەیان نواند! بەڵکو نوسینی ڕۆژهەڵات ناسەکان یەکەم ئاوازی دەرکردوو، بەپەلەش داگیرکاری فکری قۆستیانەوەو ، دووبارەیان دەکردەوەو بەبێ ئەوە لێی تێبگەن – یان هەندێك لێی تیدەگەیشتن! – بۆئەوەی هەموو هەوڵدانێك لەکاربخەن ، کەبیەوێت ئوممەت بگەڕێنێتەوە بۆسەروەریەکانی ڕابردووی!

لەباتی ئەمەش ئاڕاستەکردن بوو بەرەو سەوەریەکانی ئەوروپا !
تەماشای پێشکەوتنی زانستی بکەن ! تەماشای پێشکەوتنی شارستانی بکەن ! تەماشای بەرزبوونەوەی هزری بکەن ! تەماشای دیمۆکراسیەت بکەن ! تەماشای مافە سیاسیەکان بکەن ! تەماشی ئەو ڕێزو پایە بکەن ، کە مرۆڤ چێژی لێوەردەگرێت!

سەبارەت بە پێشکەوتنی زانستیو ، تەکنەلۆژیو، ماددیو ، ئەرێزو پایەی مرۆوڤ لە کۆمەڵگا ئەوروپیەکان چێژی لێوەردەگرێت ئەوە ئەمانە هەمووی ڕاست بوون .. هەرچی نرخو بەهای کۆتاییش بوو بۆ ئەم شارستانیەتە ئەوە کارێك بوو زۆر زۆر جیاوازی هەبوو!

بەڵام ئومەت – لەناو سەرگەردانیدا – نەیتوانی هەموو سەلبیاتەکان لەناو شارستانیەتی رۆژئاوا ببینێ .چونکە چاوی شەکەتو ماندوو تەنها تیشکەکان دەبینێتو ، ناتوانێت ڕەشاتیەکە ببینێت ،کە ڕووناکیە درەوشاوەکە ڕێی لێ گرتوەو! بانگ خوازی داگیرکاری فکریش ئەوچاوانەیان بەردەوام ئاڕاستەی تیشکەکان دەکردو ، زۆریش لێیان دەخوڕیەوە ئەگەر بیویستبایە بگەڕێت لە نێوان تیشکەکان بۆ ئەوەی لەکە ڕەشەکان ببینێت!.

بەڕاستی ئەو ڕەشاتیە زەبەلاحەی سێبەری بەسەر جیهانی ئیسلامیدا کێشابوو –،کە پێویست بوو موسوڵمانان یەکەم کەس بن هەست بە پەستانەکەی بکەن – ئەوە داگیرکاربوو، ئەوشتەش ,کە داگیرکار ئەنجامی دەدا بەرامبەر بەموسوڵمانان لە ئابڕووبردن و سوك کردنیان.

بەڕاستی داگیرکار درۆیەکی فیعلی بوو بۆ هەموو ئەو پڕووپاگەندانەی رۆژئاوا دەیان کرد لەبەرزبونەوەی بەهایو شارستانیەتی مرۆڤایەتیو باوەڕبوون بەو دروشمانەی بەرزی کردبۆوە ..واقیعە ڕەشەکەش شایەن بوو ئەوەی موسوڵمانان لە سەرەتای سەرسامبونیان بەئاگابێنیتەوە بۆدەرکەوتنی ڕاستی ئەو شارستانیەتە ساختەیەی،کە ڕووچووبوو لەخۆپەرستیو ،لەویژدانی مرۆڤایەتیش کەوتبووە ژێرەوەی ژێرەوە، هەروا بۆئەوەی بگەڕێنەوە سەروەریەکانی مێژوویان ،کە بەجێیان هێشتبوو، ئەمەش بۆ ئەوەی جیاوازی بکەن لەنێوان بزاڤی فەتحی ئیسلامیو داگیرکاری خاچ پەرستی( کە بۆیە خاچ پەرستیەکەی شاردوەو ئاشکرای نەکرد هەروەکو پێشتر ئامەژەمان پێکرد ) هەروا بۆئەوەی لەوجیاوازیەش تێبگەن ،کە لەنێوان ئوممەتی خواناسو ، ڕێبازی خواییو ، ڕەوشتی خوایو لەنێوان شەیتانەکاندا هەبوو ، ئەگەر چی با پێستیان سپی بێو

جلوبەرگیان خاوێن بێتو،بێژەکانیان ڕەوانو شیرین بێتو زانستەکانیان بەرزبێت!

ئەگەرداگیرکار بەهەموو تاریکایيو ستەمەکانی ئوممەتی ماندوو شەکەتی لەغەفلەتەکەی بەئاگا نەهێنایەوەو دەری نەهێنا لەنێوسەرگەردانیو،خراپەکانی ئەوشارستانیە ساختەیەی بۆ ئاشکرانەکرد, ئەوە– بەپلەی یەکەمیش– ئوممەت لەوە نەدەگەیشت ،کە ڕەوشتەکانی ڕۆژئاوا ئەو ڕەوشتانە نین هەڵقوڵاو بن لەباوەڕی ڕاستی بەو بەها بەرزانەی کەوا زۆرجار لەئەدەبیاتیان باسی لێوە دەکەن ، بەڵکو چەند ڕەوشتێکی سوود دار بوونو مومارەسە دەکرا بە ئەندازەی ئەوەی سوودی بۆخاوەنەکانیان دەهێنا، بەڵام کاتێك لەگەڵ بەرژەوەندی تێك گیرابان ئەوە دەتوایەوە..بەرژەوەندیش بەسترایتەوە بە سوودو نەبەسترایتەوە بە چاکسازی مرۆڤایەتی ، یان چاکسازی مرۆڤ!

لەناو سەرگەردانیدا سەرکردەکانی ئەوروپامان گرتەخۆ وەکو ئەوەی سەرکردەی خۆمانبنو !هۆشمەندەکانی ئەوروپاش وەکو ئەوەی هۆشمەندی خۆمانبنو ! ویژەوانیشیان وەکو ئەوەی وێژەوانی خۆمانبنو ، ناوەکانیانمان کردە ویردی سەرزوبانو، وشەکانیانمان دووبارە دەکردەوەو دروشمەکانیشمان کردە دروشمی خۆمان و مێژووەکەیمان ئەزبەر کرد ، لەهەمان کاتدا بێ ئاگابووین لەناو هێنانی سەرکردەو هۆشمەندو وێژەوانانمانو، هیچ شتێکمان نەدەزانی لەبارەی ئەوان ، هەتا هەواڵەکانی پێغەمبەریش– ڕەزاو رەحمەتی خوایان لێبێت– هەتا ڕووداوە گەورەکانیش ، کە بەسەر نەوەی یەکەمدا هاتو، مێژووی ئەو ئوممەتەی بە چەند پیتێکی ڕووناکی درەوشاوەی پێ نوسرایەوە!

لەناو سەرگەردانیدا بزاڤە زانستیە مێژوویەکەمان لەبیر کردو ، تێنەگەیشتین ، کە هەر موسوڵمانان ڕێبازی ئەزمونیان دامەزراند لە لێکۆلینەوەی

زانستیداو ، هەر ئەوان بوون خراتی زەوییان دۆزیەوەو ڕەهەندەکانیان پێواو، هەر ئەوان بوون سووڕی خوێنیان دۆزیەوەو،هەر ئەوان وێنەی نەخشەکانی یەکەمیان کێشا بۆ جیهانو ، هەر ئەوان بوون شوێنی ئەستێرەکانیان دیاری کردو ، هەرئەوانو..هەرئەوانو ..هەرئەوان..واهاتە ئەندێشەمان ،کە زانست هەمووی لە ئەوروپا دەستی پێکردەو هەر لەبلیمەتی رۆژئاوا سەری هەڵداوەو ، لەهیچ شوێنێکیش بلیمەتی نیە تەنها لە رۆژئاوا نەبێت !

هەروەها نیشانەی شارستانیەتەکەمان لەبیر کرد,کە شارستانیەتێك بوو هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەموو مرۆڤدا کرد : لەلەشو هۆشو گیانیو, بەگشت گیریو پێکەوە بەستانو هاوسەنگی ، شارستانیەتی مرۆڤایەتی ڕاستی ، کە دڵی کردەوە بۆهەموو مرۆڤایەتی بەبێ جیاوازی کردن لە ڕەگەزو ڕەنگو زمان هەتابیرو باوەڕیش..بەڵام شارستانیەتی رۆژئاوا بەلوت بەرزیەکی قێزەونو پیس تەنها شارستانیەتە بۆ پیاوی سپی ، کە قەت ناگەرێتەوە بۆ چەمكو وتەی خوایی (یا أیها الناس إنا خلقناکم من ذکر وأنثی وجعلناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا إن أکرمکم عند الله أتقاکم ) ئەی خەڵکینە ! هەرلە نێرو مێیەکەوە ئێوەمان وەدی هێناوەو کردومانن بە چەند گەلێكو چەند هۆزێك هەتا یەکتری بناسن بەرێزترینتان لای خودا پارێزگارترەکانتانن ﴾ سورەتی حجرات: 13

(کلکم من آدم ، وآدم من تراب [1] : هەموتان لە ئادەمن ئادەمیش لە خۆڵە)

لەناو سەرگەردانیدا کیتابی خوا بووە کەلەپور..

کەلەپورێکە لەبابو باپیرانمان بۆمان ماوەتەوە ، ئەوان – پاپەندبوون پێی– . بەڵام لەسەر ئێمە هیچ فشارێکی نیە ! ئێمە ئوممەتێکی ترینو! قسە

---

(1)اخرجه مسلم و ابو داود

لەگەڵ ئێمەداناکاتو ، داواناکات بەجێبەجێکردنی ئەوشتانەی لە ناوەرۆکی دایە
.ئەوەی پەیوەندی هەیە بە ئێمەوە– ئەگەر پەیوەندی هەبێ– دڵمان بە
خوێندنەوەی خۆشبێتو ، گوێچکەکانمان بە زەنگوڵەکەی بهەژێ، بەڵام شوێنی
تێڕامانو بیرکردنەوە نیەو ، هی وەی نیە لە کاروبارەکانی ژیانی رۆژانەدا سود
ببەخشێت ، نە لە ژیانی فیکری, نە لەژیانی کۆمەڵایەتی, نە لەژیانی ئابووری,
نەلەژیانی سیاسی .. ئەمانە هەمووی سەرچاوەیەکی تری هەیە .. ئەوەتانێ ..
لەلای ئەوگەلەی بە عەرەبی قسە ناکەنو .. باوەڕیان بە قورئان نیە !

جیهانی وێژەش لە سەرگەردانی قوتاری نەبوو..

ئەدی وێژە هەر ئەوەنیە ,کە گوزارشت لە شتە شاراوەکانی دەروونو
خولیاکانی هۆشو ئەزمونی مرۆڤدا دەکات؟ کاتێك ئەمانە هەمووی دەچێتە ناو
سەرگەردانی ، بەوێنەیەکی وێژەییی یان هونەری دەربڕین بۆی چۆن دەبێت
..مەگەر بە وێژەی سەرگەردانیو هونەری فەوتان بێت؟!

لەسەرەتای سەرگەردانیدا ئێمە هەموو وێژەی عەرەبیمان هەڵگرتو لەسەر
تەرازووی رۆژئاوامان دانا ، جا بە داخەوە بۆمان دەرکەوت ،کە هیچ وێژەیەکمان
نیە !

هەستمان کرد هەمووی – یان زۆربەی – دەچێتە ژێر دێڕێك لە دێڕەکانی
هۆنراەی یۆنانی ، ئەو هۆنراوانەی ، کە بنچینەی بنچینەکانن لە هونەری قسەو
هونەری هزرو هونەری ژیان ., ئەو بەندەش هۆنراوەی گۆرانی (الشعر الغنائی)
بوون lyrical poetry ئەو هۆنراوانەی شوانەکان لەکاتی مەڕ لەوەڕاندنیان بە
گۆرانیەکەی دڵی خۆیان خۆشدەکردو ئارەزووخەم وخەفەتو یادەوەریو دڵتەنگی
خۆیانیان تێکەڵ دەکرد.. بەڵام ئێمە هیچ داستانێکمان نیەو، شانۆگەری

هۆنراوەیشمان نیە ..لە لامان نیەو .. لە لامان نیە .. دەردو بەڵا هەرە گەورەکەش ئەوەیە ، کە ناسۆرو نارحەتی لەوێژەکەمان نیە !

بەڵام ناسۆرو نارحەتی یۆنانی وێژەی دینو دونیایە. پوختەی ئەزموونی مرۆڤایەتی قوڵەو بەرەو قوڵایی دەروات .. قوڵایی دەروونی مرڤایەتی ، قوڵایی ئەوسوننەتانەی حوکمی ژیانی مرۆڤ لە سەرزەوی دا دەکات .. وێژەی ئێمەش, کە بەتاڵە لەم شتانە شتێکی چەند نەنگەو نەنگی لەپاش ئەوەدا نیە !

لەڕاستیدا ناسۆرو نارحەتی یۆنانی – لەگەڵ ئەو هەموو قوڵاییو وردیو ئەو وەستایەی لە بەجێگەیاندنی هونەریدا هەیبوو ئەوەکێشەی مرۆڤ بوو لەگەڵ خوداکان !

مرۆڤ دەیەوێت بوونی خۆی بسەلمێنیت.. دەیەوێت خۆی دیاربخات ..دەیەوێت بکەرێکی کارابێتو هەموو شتێك بکات .. دەیەوێت قارەمانیەتیو سەروەریو شتە لەئاسا بەدەرەکان بنیات بنێتو دروست بکات( لەڕاستیدا دەیەوێت ببێتە خوا) خوداکانیش حەسودی بە مرۆڤ دەبەنو, هەوڵدەدەن کۆسپولەمپەر لەڕێگای دابنێنن , لە کۆتایشدا کاتێك ڕەتی گوێڕایەڵی دەکاتەوە بۆ خوداکانو موکوڕە لەسەر عەزیمەتی خۆی ئەوە تێك وپێکی دەشکێنێت ..جا لێرەدا ناخۆشیو ناسۆریەکان ڕوودەدەن !

ئایا بینیت ؟!

وێژەی ئێمەش ناسۆری ونارحەتی تێدا نیە.. چونکە ئێمە ئوممەتیکی ساویلکەینەو تاقەتی چوونە ناو قوڵایی نیەو ..لەپەراوێزی ژیاندا دەژیتو ناچیێە ناو قوڵاییەکەی.. !

من پێشتر لە زانکۆ وێژەی ئینگلیزیم دەخوێندو ، بنچینە ئیغریقیەکانیان بە ئێمە دەگوت بەئیعتیبار ئەو سەرچاوانەبوون ، کە تاماوەیەکی دوورو درێژ

وێژەی ئەوروپای لێ هەڵدەهێنجرا ، بەهەمان شێوەش ئەو پێوانانە بوون ، کە ڕەخنەگرەکان ڕوانینی خۆیان بۆ وێژەو ڕاست کردنەوەی لێ هەڵدەهێنجا ،منیش هەر لەهەمان کاتدا گوێم لەو وتەو ڕەخنانە دەگرت ،کە ڕەخنەگرەکانمان بەگشتی لەوێژەی عەرەبیان دەدا ، جا لە خۆمەوە سەیرم پێدەهات..، کە چۆن خەڵکی تا ئەو سنورە شێوەیان دەگۆڕێت!

ئەمە وەنەبێ بەرگریکردن بێت لە وێژەی عەرەبی .. کە چی لە ناودایەو چی لەناو دانیە مەسەلەکە ئەوەنیە ! مەسەلەکە ئێمەین ،کە چۆن تا ئەو سنورە کەسایەتیەکەمان توایتەوەو ، وامان لێهاتوە بە چاوی خۆمان سەیر ناکەین ، بەڵکو چاوی خەڵکی دەخوازین بۆ ئەوەی تەمەشای خۆمانی پێبکەین؟!

خۆ هیچ رۆژێکیش لە ڕۆژان وێژەوانو ڕەخنەگر نەبویمە .. بەڵام لەکاتی لێکۆلینەوەم بۆ وێژەی ئینگلیزی تێبینیەکم بۆدەرکەوت ،کە بەگتشی نمونەیەکە بۆ وێژەی ئەوروپی لەگەڵ بوونی چەند جیاوازیەك ،کە بەشێوەیەکی سروشتی لە نێوان گەلێك بۆ گەلێك , یان لە نێوان وێژەوانو وێژەوانێکی تردا هەیە ..

بەڕاستی بیرۆکەی کێشە لە نیوان مرۆڤ و خودا ( یان خوداکان هەروەکو بت پەرستانی یۆنان وێنەیان کێشا) لە هەموو چەشنەکانی وێژەی رۆژئاوادا زۆر قوڵە.

لە ئەفسانەکانی یۆنانیدا زۆر ڕوون ئاشکرا بوو بە تایبەتی ئەفسانەی – برومیثیوس– دزی ئاگری پیرۆز کە دەگیرێتەوە خوازیۆس –کە خودای خوداکان بوو–مرۆڤی لە چنگێك قوڕی زەویدا دروستکرد پاشان لە سەر ئاگری پیرۆز ڕێکی خست ( لە ئەفسانەکە ئاماژە بۆ زانیاری دەکات) پاشان بەتەنها لە تاریکی هەناردیە خوارەوە( مەبەستی لە تاریکی نەفامیە) بونەوەرێکی ئەفسانەیی ، کە ناوی – برومیثیوس– بوو بەزەیی پێدا هاتەوەو ( لە وانەیە خواش دەزانێت

مەبەستی شەیتان بێت) ئاگری پیرۆزی لە خوا بۆ دزی ( ئاماژە دەکات کە مرۆڤ دەستی کرد بە فێربوون ) جا خودا پێکەوە لە هەردوکیان تورەبوو (برومیثیوس) دزی ئاگری پیرۆز ولەگەل (ئیپیمیسیوس)ئەومرۆڤەی خودا لە قوری زەوی دروستی کرد ، ( ببرومیسیوس) یش بازێکی ڕاسپارد بۆ ئەوەی بەدرێژایی ڕۆژ جەرگی بخوات ، لە شەویش جەرگێکی نوێی بۆ دەڕوا بازەکەش بەیانی دەهات بە درێژایی رۆژ دەیخوارد .بەم شێوەیە لە ئەشکەنجەو ئازارێکی بەردەوام ..بەلام ( ئیپیمیسیوس) ،کەخودا نەیتواتی ئاگری پیرۆزی لێبسێنێتەوە(ئاماژە بەوە دەکات ، کە ئەو زانیاریەی مرۆڤ بە دەستی هێناوە ناتوانرێت لێی بسەندرێتەوە)ئەوە ئافرەتێکی بۆ نارد ناوی باندۆرا بوو ( ئاماژە بۆ حەوا دەکات)بۆ ئەوەی لە تەنیایەکەی هۆگری بێت ، لە گەڵیشیدا سندوقێکی بە دیاری بۆ نارد جا کاتێك سندوقەکەی کردەوە بینی پڕیەتی لە شەڕو شۆڕ ! شەڕو شۆڕەکانیش لە ناو سندوقەکە هاتنە دەرێو هەموو دونیایان پڕکرد ! !

ئابەم شێوەیە ئەفسانەی ئیغریقی پەیوەندی نێوان خوداو مرۆڤ پیشان دەدات ! زانست خەڵاتێکی خودا نیە ،کە خودا بە میهرەبانی خۆی پرژاندبێتیە سەر مرۆڤ : ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ﴿٣١﴾ ﴾ البقرة: ٣١: خودا هەموو ناویکی فێرە ئادەم کرد. ﴿ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴿٥﴾ ﴾ العلق: ٥: مرۆڤی لە شتێ راهێنا کە زووتر پێی نەزانیبوو . ﴿ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ﴿٤﴾ ﴾ الرحمن: ٣ - ٤ مرۆڤی ئافراند لە ئاخافتنی تێگەیاند.

بەڵکوبەزۆری لە خوا زەوت کراوە ! خواش کاتیك ( پەنا بەخوا )– غیرەت پاڵی پێوەدەنێت – نایەوێت مرۆڤ فێرە زانست بێت و، نایەوێت سودمەند بێت بە زانستەکەی ، بۆیە بەم جۆرە تۆڵەی لێدەسەنێتەوە !

ئەمەبوو تۆی ناسۆرو نارحەتیەکان لە ژیانی مرۆڤ هەروەکو ، کە ئەفسانەی ئیغریقی نیشانی دەدات ..

ئەمانەبوون – خوابت پارێزێ – لە وێژەی عەرەبی و ئوممەتی عەرەبیان کەم بوو !

بەڕاستی من شوێن پێی ئەفسانەی ئیغریقی کەوتم لە وێژەی ئەوروپی پاش ئەوەی ئەوروپا دەسەلاتی کلێسەی لە ژیانی خۆی دەرهێناو،گەڕاوە بۆ بنچینە ئیغریقیەکانو هەر لە سەرەتای چەرخی ڕاپەرینەوە چەمکەکانی ژیانی لێدەردەهێنا ،لێرەدا شتێکی سەیرم بە دیکرد.

ئەوروپا گەڕایەوە – کەمترین شت لە وێژە – بۆ بت پەرستی ئیغریقی لە ماوەی ڕۆمانسیەتو سروشتی پەرست وەکو خوایەکی نوێ لەجیاتی کلێسە ، کە بەم ناوە خەڵك دەیپەرست .. لە دەروونی ئەوروپیەکان کێشەیەك لە نێوان مرۆڤ و ئەو خوایە نوێیە دروست بوو! ، کە لەکتابەکانی خۆیان باسیان لە(کێشەی ئەو مرۆڤ و سروشتەدا کردو) وتیان : (مرۆڤ سروشت دەبەزێنێت) !

پاشان ئەوروپا مرۆڤی لە باتی خوا کردەخوا..کێشەکە سەر لە نوێ گەڕایەوە لەگەڵ خوایە نوێیەکە !جاچ کێشەیەکی دەروونی بێت لەمرۆڤیکی تاکدا ، یان کیشەیەکی کۆمەلگا بێ لە نێوان هەندێك مرۆڤ ومرۆڤی تردا!

هیچ ئاشتیەك نیە ! هەردەبێت کێشە هەبێت!

ئەو کێشەیە نەبوو،کەخوای گەورە رێی پێ دایەو پیرۆزی کردوە ,ئەویش کە کێشەی چاکە دژی شەڕە ،کە خوای گەورە دەربارییەوە دەفەرمێت ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ ﴿٢٥١﴾﴾ البقرة: ٢٥١ : ئەگەرخودا هێندێکانی لەو ئاپۆرە بە هێندێکان تەرتوتونا نەکردایە ، ئەم زمینە خرا ببوو.

﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ﴾ الحج: ٤٠: ئەگەر خودا هێندێکیانی بە هێندیك ڕاونەنابا ، دێر و کلیساو کەنسشت مزگەوتەکان —کەلەواندا فرە ناوی خودا دەبرێت—وێران دەکران خودا دەهانای ئەوانە دێت کە یاریدەی خودا دەدەن: دیاریشە خوا زۆر بەهێزو دەسەلات .

بەڵکو ئەمە کێشەی نێوان مرۆڤ و خوایە !

ئەوەش - هەی خوا بت پاڕێزێ— ئەوشتانە بوون لەوێژەی عەرەبیان کەم بوو بۆ ئەوەی ببێتە وێژەیەکی جیهانی و قوڵایی هەبێت!

پاشان ئەوروپا وێژەکانی بێسەروبەر بوون ئێمەش لەگەڵیدا بێ سەروبەر بووین .. ئەمەش تەنها بۆئەوەی ئەو بێ سەروبەریەمان لەگەڵیدا لەقیس نەچێت !

پاش قسە هەلیتو پەلیتەکانی فرۆید لەعەقلی باطین و نەست دا، مەزهەبی سرپالیەت[1] بەدیارکەوت جاوتمان دەبێت ئێمەش سرپالیەتمان هەبێت.. ئای چەند نەنگە .. چۆن لەگەڵیان بەگەر ئەو مەزهەبە نەکەوین؟!

پاشان لامەعقول پەیدابوو ، جا وتمان پێویستە ئێمەش وێژەی لامەعقولمان هەبێت ! بۆیە یەکێك لەوێژەوانە گەورەکانمان شانۆگەریەکی لامەعقولی دامەزراندو ناوی نا یاطالع الشجرة، کە پێشەکیەکی بۆداناو تیایدا وتی :

(1) سریالیەت مەزهەبێکی ئەدەبیە فەرامۆشی هەموو شتە مەنتیقیەکان دەکات لەسالی 1924 سەری هەڵداوە.وەرگێڕ

ئەم شانۆگەریەم نوسیەوە لەسەر ڕێگای لامەعقول بۆ ئەوەی پێمان نەڵێن وێژەی لامەعقولیان نیە !

وای چەند سەیرە ! بەڕاستی ئەوروپا لەڕاپەڕینەکەی بیّ سەروبەربوو بۆیە بای داوە بۆ عەقلانیەتی لەڕادە بەدەر بۆ تۆڵە سەندنەوە لەکلێسە کاتێك ماوەی دە سەدە ڕێگای لە عەقل گرت ، بۆیە ئەوروپا عەقڵی هاوێشتە ناوهەموو شتێك جا یەکسان بوو بواری بۆ عەقل تیادا بوایە یان نا .. پاشان بۆی دەرکەوت ,کە عەقل گێروگرفتەکانی بۆچارەسەر نەکرد بەڵکو چەند گێروگرفتێکی نوێی بۆپەیداکرد کاتێك خۆی هەڵدەقوتاند لەو شتانەی تاقەتی پێدا نەدەشکا .. جا پازی دا بۆ لامەعقول بۆئەوەی لەدەستی عەقلانیەتی لە ڕادەبەدەر هەڵێت .. ئەی ئێمە چیمانە؟! بۆچی بابدەینەوە بۆ لامەعقول؟!

پاشان نوێخوازی پەیدابوو .. وتمان هەردەبێت وێژەیەکی نوێخوازمان هەبێت ..چەند نەنگە ! ئایا وێژەکەمان نوێخوازی تیدانەبێت و ببین بە دواکەوتوو؟!

گەوهەری ڕاستیش بۆ نوێخوازی لابردنی کەلەپورەو هەڵاتنەلێی ئەگەر با بۆ هیچیش بێت!

گرنگ ئەوەیە کەلەپور لەناوببەین – کەکۆت وزنجیر دەنوێنێت – ئێمەش بەرەو سەربەستی و رزگاربوون دەرۆین! بەڕاستی ئەوروپا کاتێك ئەوکارە دەکات ئەوە سەربەستەو چی بۆخۆی بیکات دەیکات .بۆی هەیە بیانوشی هەبێت چونکە کەلەپور لەلای ئەو کلێسەو شتە پڕپوچەکانی و یاخی بوون وزوڵم ستەمیەتی ، هەروا کارخستنی هێزی مرۆڤە لە کردەوەی بەردار لەواقیعی زەویدا.جالەناوبردنی ئەوکەلوپورەو هەڵاتن لێی ئەوە کارێکی مەعقولە ..

هەرچی موسوڵمانانیشن کاتێك کەلەپورە خواییەکەی لەناودەبات ، ئەوە تەنها تێژەنینی بۆ دەمینێتەوە لە ناو سەرگەردانی؟!

*            *            *

ئەوسەرگەردانیەی ئوممەت چووە نێوی ئەوا قەبارەکەی بەم شێوەیە بوو .. زۆر بەرفراوان وگشت گیر بوو .. هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتەوە .. بە گوزارشتێکی تر لاڕێ بوون بوو هەموو داخوازیەکانی لا اله الا الله ی گرتەوە ، چونکە داخوازیەکانی لا اله الا الله هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە.. (1)

﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لَا شَرِيكَ لَهُ (١٦٣) ﴾

الأنعام: ١٦٢ - ١٦٣: بێژەمن نوێژکردنم و پێکهێنانی ڕێ و شوێنی حەجکردنم و ژین و مەرگم، بۆ خودایە : کە ڕاهێنەری دونیایە هەرخۆیەتی هیچ شەریکی نیە .

بەهەرجۆرێك بێت ناڵێن گێژاوەکە هەموو خەڵکی لول داو ،کەس لەناو ئوممەت نەما ئەندازەی ئەوکەمو کوڕیە کاری تێ نەکات ،کە تووشی هات کاتێك چووە ناو سەرگەردانی ..

نەخێر ! ئەمە بەهیچ شێوەیەك ڕووی نەداوەو ، نابێت ڕووبدات ( لاتزال طائفة من امتی ظاهرین علی حق ، لایضرهم من خالفهم (2) : بەردەوام کۆمەڵێك هەنە لە ئوممەتی من ، کە دیاربن لەسەر هەق ، نەیارەکانیشیان زەرەریان پێناگەیەنن)

بەڵام گێژەلوکەکە ئەوەندە بە هێز دەخولایەوە بەجۆرێك نەیارەکانی فڕێداو لە چەقی ئاراستەکردن دووری خستنەوەو ، ئەوخەڵکانەی بەدیارخست ،

---

(1) ئەگەر دەتەوێ تەمەشای بەشی مقتضیات لااله الا الله فی الرسالة المحمدية لە کیتابی لا اله الا الله عقبدة وشريعة ومنهاج حياة بکە.

(2 ) اخرجة الشيخان .

کەژەهرەکەیان هەموو خواردبۆوەو,کە وای لێکردن هەر ئەوان ببنە سەرکردەو سەرکردایەتی بکەن .. لە هەموو گۆڕەپانەکان .. لە سیاسەت و ئابوری و کۆمەڵایەتی و هزرو وێژەو هونەر .. بەڵکو لە هەموو شتێکدا.

لەکاتێك لە کاتەکاندا دەرکەوت ، کە ئوممەت نێوانی خۆیی و ئاینەکەی پچڕاو ، نێوانی خۆیو کەلوپورەکەیو مێژووەکەی پچڕاو.. رێگای ئەوروپای گرتە بەرو .. قەتیش ناگەرێتەوە !

بەڵام لەڕاستیدا ئوممەت بە کەسایەتیەکی دووانە (مزدوج) دەژیا ..

ئەگەر بێتوو ئەوکەسانە هەڵاوێر بکەین ، کە بەتەواوی خۆیان داماڵی بوو لە ئایین و کەلەپورو مێژوویانو داماڵینەکەی خۆیان ڕاگەیاندبوو شانازیان پێوەکرد – کە لەدەروونەوە وایان گومان دەبرد – بوینە چەند بیرمەندێکی سەربەست وەکو بیرمەندە سەربەستەکانی ئەوروپا. FREE THINKER [1].

ئەگەر بێتوو ئەمانەو ئەمانە هەڵاوێر بکەین ،کە کەمایەتین لەهەردوو لایەندا ،ئەوا تێکرای ئوممەت – کە سەرگەردانی لولیدا– بەکەسایەتیەکی دووانە (مزدوج)دەژیا: ئایین لەسۆزو ویژدانو هەندێك لەهەڵس وکەوتی داماوەو فیکرە نێردراوەکەش بەهێزە توندو یەك لەدوا یەکەکەی ئەو ئەفکارو هەست و ڕەوشتانەی دەگۆڕیو وێنەکەشی بەردەوام دەلەراندەوە لەپێش چاوانو ئەو کەسەی تەماشای دەکرد ڕوخسارەکەی دیار نەدەکەوتو ، لەناوەرۆکی دڵنیا نەدەبوو. .

(1) free thinker : ئەم وشەیە لە فەرهەنگە ئینگلیزیەکان مانای بیرمەندی سەربەست ناگەیەنێت بەڵکو مانای بێ باوەر دەگەیەنێت.

بەڕاستی ئەوروپا پێشتر ماوەیەکی هاوشێوەی ئەوە ژیا ،لەگەڵبوونی جیاوازی ئایین و،جیاوازی بیرو بۆچوونەکانو ،جیاوازی هەڵسوکەوت .

کاتێك دەسەڵاتی کلێسە کزبوو ئەو زاڵبوونەی نەما،کە پێشتر هەی بوو لەسەر گیانی خەڵکیو ڕاپەرینەکەش دەستی پێکرد ،کەلەچەمکەکانی دا هەڵگەڕاوە بۆ کەلەپوری ئیغریقی ، یان ڕۆمانی ئیغریقی greco roman ئەوا خەڵکی – بەگشتی – بە کەسایەتیەکی دووانە (مزدوج) دەژیان : پاشماوەکانی ئایین ،لەگەڵ دەست پێکردنی خۆدامالین لێی. .

بەڵام ئەو حالەتە نابێت بەردەوام بێت. .

بەرەبەرە هەردەبێ یەکێك لەو کەسایەتیانە زاڵبێ بەسەر ئەوی تریان هەتا دەیتوێنێتەوە ، یان کەمترین شت لەبەر سێبەری خۆی دەیشارێتەوە !

بەڕاستی هەروەکو،کە پێش بینی دەکرا لەبارودۆخەکانی ئەوروپا ئەوا ئەمە ڕوویدا . . ئەوروپا وای لێهات کەسایەتی لەئایین داماڵاوی هەر بەهێز دەبوو،هەتا بەتەواوی کەسایەتی دینداری سڕیەوە یان کەمترین شت شاردیەوە لەناو سێبەردا. ئەوەی پێش بینیش دەکرا بۆ ئوممەتی ئیسلامی بەهەمان دیاردەدا بڕوات،ئەویش دیاردەی کەسایەتی دووانە بۆ ماوەیك ،پاشان لەکۆتاییدا یەکێك لەو کەسایەتیانە بەسەر ئەوی تریان زاڵ دەبێ.

لەڕاستی دا ئوممەت چووە ناو ئەزموونەکەو چەند کەڕەتێکی زۆری لەناو دابڕی. . !

پاشان یەکێك لەو کەسایەتیانە دەستیکرد بە شاردنەوەو..ئەوی تریان دەستی کرد بەسەر هەڵدان و ئاشکرابوون ! بەڵام زۆربەی ئەوانەی پێشبینیان دەکرد کارەکە وادەرنەکەوتو ! بەتەواوی پێچەوانەی ئەوەبوو،کەلە ئەوروپا ڕوویدا. . !

ئەوکەسایەتیەی دەستی بەسەر هەڵدان دەکرد ئەوا ئەو کەسایەتیەبوو،کە دەگەڕاوە بۆ ئیسلام !

## ڕابوونی پیرۆز

ڕابوون هات بەجۆرێك ,کە خەڵکێکی زۆر پێش بینی نەدەکرد بێت،جایەکسانە چ ئەوانەی لەناخی دەروونی خۆیان ئاواتیان دەخواست، یان ئەوانەی،کە هەر حەزیان لێنەبوو قەت بێتن!

ئوممەت ئەو کات زۆر ڕووچووبووە ناو سەرگەردانیو زۆر دوور کەوتبۆوە لە ڕێگای ئیسلام .

هەرچی خاچ پەرستەکان و سەهیۆنیەکان بوون،ئەوانەی بەکەمی دووسەد ساڵ پیلانیان گێڕا بۆ دوور خستنەوەی ئوممەت لە ئایینەکەی ئەوا واگومانیان برد کەوابەیەك جاری سەرکەوتوینەو بەتەواوی لەناویان بردوە . .بەڵگەشیان لەلابوو کاتێك ئەو گومانەیان دەبرد لەوەی دەیان ڕوانیە حاڵ و باڵی ئەو ئوممەتەو چۆن بەو خێراییە ئەوەی پەیوەندی بەئایینەوە هەیە خۆی لێ دادەماڵێ، هەتا دوورشمەکانی پەرستنیش تەنها دانیشتوانی گوندەکان ئەنجامیان دەدا لەگەڵ بەتەمەنەکان،بەڵام گەنجەکان ئەوانەی ڕوویان کردە مەدەنیەتو پێشکەوتنو ڕزگاربوون ئەوا هەروەکو پێشتر باسمان کرد– مزگەوتی بەجێ هێشت وئارەزووشی چووە بەدواداچوونی هونەرمەندەکانو گۆرانیە نەرمو

شلەکانو فلیمەکانی سینەما ئەمە چ جای خۆ خەریك كردنی بەو دۆستایەتیە پاك وناپاكانەی ،گۆرەپانی ئەوکاتی پڕکردبوو لەپاش ڕزگار کردنی ئافرەت. .

کارەساتەکەش تەنها لاڕێبوونی ڕەوشت وهەڵس وکەوت نەبوو، بەڵکو ترسناکتربوو لەمە،لاڕێبوونی بیروبۆچوونەکان بوو.

لاڕێبوونی ڕەوشتو هەڵسوکەوت لەگەڵ ساغ و دورستی بیروبۆچوونەکانو بیروباوەڕەکان بۆی هەیە خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە بۆئەوەی ڕەوشتو هەڵسوکەوتی ڕاستبکاتەوە ، لە ساتێك ویژدانەکەی بە ئاگا دێنێتەوەو، واز لە گوناهەکان دێنێو ڕاستەڕێ دەبێ.بەڵام ئەوەی بیروبۆچوونو عەقیدەکەی گەندەڵ بووە بۆچی بگەڕێتەوە، ئەوەی دەیبینێ ڕاستەو هەڵەی تێدانیە، بەڵکو– بەپێچەوانەوە– وادەبینێ ،کە گەڕانەوە بۆ ئایین هەڵەیە؟ هەرچی کلکەکانیشیان بوون لەو ڕۆشنبیرانەی،کە ژەهرەکانیان هەموو دەردخوارددان و کەیف خۆش بوون پێیو،هەستان شانازیان پێوەکرد بەوەی وەکو ئەوروپیە بێگانەکانینان لێهاتووە. .لە بیروبۆچونیان وعەقیدەیان وڕێگەی هەڵس وکەوت کردنیان بەڵکو لەهەموو شتێك. .ئەوانە وەکو گەورەکانیان واگومانیان برد،کە هیچ جارێکی تر ئیسلام نایەتەوەو هەڵناستێتەوە سەرپێی خۆیو هەر ئەوان پێشڕەونو دێدەوانی وەچەرخاننو– لە فراوانترین دەرگا چووینە ناو مێژوو– هەر ئەوان سەرکردایەتی نوێی کۆمەڵگانە،کە کۆمەڵگا هەموو بەرەو ڕووناکی دەبەنو. .لە تاریکاییەکان دەری دەهێنن ..

گومانی ئەوانەش لە بنچینەدا دامەزرابوو لەسەر ئەزموونی ئەوروپی . .

ئەوروپا ئوممەتێك بوو ڕۆژێك لەرۆژاندا دین داربوو ، دین لە هەموو کاروبارەکان ژیانو هزری بوو سەرچاوەبوو دەگەڕایەوە لای. .پاشان لێی لاداو

، لەبیری کرد وەکو ئەوەی هەر نەیبوبیّو، ڕەوانەی مۆزەخانەی مێژووی کردو ،جارێکیتر بە نوێی لە دایك بوو هیچ پەیوەندیەکی بە بارودۆخەکانی پێشترنیە .

موسوڵمانانیش ڕۆژێك لە ڕۆژاندا دینداربوون، دین ژیانو هزرو سەرچاوەیان بوو. .پاشان دەستیان کرد بەلادان لێی بەهەمان ئەو هۆکارو هزرانەی ،کە وای لە ئەوروپا کرد لەدین دەربچێو پاشان لەبیری بکات ..چ شتێك دەبێتە ڕێگری ئەوەی ،کەئەو ئەنجامەی لەوی ڕوویدا لێرەش ڕوونەدات؟!

لێرەدا هەڵەیان لە ئەندزەگیریدا کرد. .!

سەرەتا دەلێین بەڕاستی ئەوەی خودای گەورە ویستی بۆ ئوممەتی ئیسلامی نەی ویست بۆ ئەوروپا. .ئەوشتەی ڕووش دەدا هەر بەویستی خودایەو نەك بە ویستی مرۆڤ . .بەڵام بەهەمان شێوە دەڵێین قەدەری خوا بەپێی چەند سوننەت و هۆکارێك دەرواتو دەچێتە سەر. .

چی وای کرد ئەوبارودۆخەی ئێرە جیاوازی هەبێت لەبارو دۆخی ئەوانو،ئەنجامەکەشی کردە شتێکی ترو جیاواز لە ئەنجامەکەی ئەوان؟!

لەڕاستی دا چەند کاروبارێکی زۆر، کە خاچ پەرستەکانو سەهیۆنیەکانو کلکەکانیان لەڕۆشنبیرەکان پەیان پیّ نەبردو لێی تێنەگەیشتنو.. خودی ئوممەتیش ئاوڕی لێنەدایەوە تەنها کاتێك دێدەوانەکانی دەستیان کرد بەدەرچوون لەسەرگەردانی. .

یەکەم جیاوازی لەهەردوو دیندا هەبوو . .ئەوەش شتێکی زۆر گەورەبوو . . لێرەدا دینێکی خوای هەق هەیە،کە خودای گەورە کیتابەکەو سوننەتەکەی پاراستوە،خەڵکی چەندی لێی لاڕێبن لەکاتێك لەکاتەکان ئەوا دەتوانن بگەرێنەوەلای،چونکە سەرچاوەکە هەیەو, نەلاڕێبوەو نە گۆردراوەو

،دەستی گۆڕانکاری نەگەیشتوتیێ ، دینەکی تریش هەیە ،کە ئەوروپا
بنچینەکەی نازانیێ نە لەواقیعە کۆنەکەی نە لەواقیعە نوێیەکەی ،کیتابەکەیان
لارێبوەو گۆڕدراوە ،ئەو عەقیدە یەکتاپەرستیەی خوا ناردویە خوار بۆ
پێغەمبەرعیسا– علیه الصلاة والسلام – گۆڕا بەعەقیدەیەك خوا
نەیناردبووەخوار،کە یەکی کردە سێو , سێی کردە یەكو ئاوێتەیەکی
دژبەیەکیشی دامەزراند،کەعەقڵ وەری نەدەگرت ،ئەمە چ جای دابڕانی عەقیدە
لەشەریعەتو پێشکەش کردنی دین بەبیێ تەشریع.

جیاوازیەکی تریش هەبوو،جیاوازی ئەو پیاوانەی ئەو دینەیان هەڵگرتوو
فێرەخەڵکیان کرد.

لێرەدا زاناکانو شەرع زانەکان هەنەو ،پیاوانی چاکەکارو پارێزگار هەنە،
بەپێشەنگ وئامۆژگاری چاکو زانستو فیقه بانگەشە دەکەن بۆ دینی
خوا،خەڵکیش لەسەردەستی ئەوان فێردەبنو، لەسەر ڕۆشنایيو
بەتێگەیشتنەوە شوێنیان دەکەونو ، مومارەسەی دین دەکەن بەوەی ئەو
پیاوانە مامۆستاو پەروەردەکەرن و پێناو نینە لە نێوان بەندەو گەورەکەی . .
لەوێش پیاوانی دین هەنە جادووگەرنو هەڵدەستن پێناو لەنێوان بەندەو خودادا
دەکەنو ڕاڤەی دین هەمووی بەخۆیان دەکەن ، بۆ ئەوەی عەقلەکان بەردەوام
داخراو بن لەڕاستی ودورستی دینو هیچ نەزانیێ تەنها مەگەر ئەوانەو. .ئەوانە
بۆیان بلێنو شتێکیشیان بۆنالێن شیفا بێت بۆدڵەکانیان, بۆ خۆیان پارێزگاری
دەکەن بەچەند پلەوپایەکی ساختە لەدەروونی شوێن کەوتەکانیان بەگومانی
ئەوەی هەر ئەوان نهێنیەکان دەزانن، بەڵام لەڕاستیدا ئەوان زانیاریان دەربارەی
ئەو نهێنیانە لەخەڵك زیاترنیە،چونکە بەسروشتی خۆی ئەو نهێنیانە قابیل نیە
بۆ تێگەیشتنو (تصدیق)کردنیش هەڵناگریێ!

جیاوازی سێهەمیش جیاوازی واقیعی مێژوویی بوو . .ئەمەش جیاوازیەکی زەبەلاح و گەورەیە.

موسوڵمانان واقیعێکی مێژوییان هەبوو دین بەتەواوی تیایدا جێبەجێ کرا ،کە شکۆ ترین و خۆشترین واقیع بوو لەمێژووی هەموو مرۆڤایەتی . .ئەم سەدەیەش سەدەی پێغەمبەرایتیو خیلافەتی ڕاشدین بوو، پاشان واقیعە مێژووییەکە ماوەکەی درێژ بۆوە بۆ چەند سەدەیەك ،کەچەند لاڕێبوونەکو پێدرێژیەکی کەوتە ناو، بەڵام ئەوەندەی لەڕاستی دین بۆ ماوە بۆئەوەی ژیانێکی شکۆمەندو بەرچاو دابمەزرێنێ لەگەڵ بزاڤێکی زانستێکی بەرز، کە توانی بەتواناو پێگیر بێت لەهەموو لایەنەکان : لەسیاسەتو جەنگو زانستو هزرو ڕەوشتو ئابوری وکۆمەڵایەتی ،کە ناوو دەنگەکەی گوێو وچاوی دونیای پڕکردو ، مێژووش تێی گەیشت . .لەبەرامبەر ئەمەش لەلای ئەوروپیەکان – بەدان پیانانی خۆیان– چەندسەدەیەکی تاریکایی ناوەڕاستیان هەبوو ،کە لەهۆشو بیریان بەسترابۆوە بەزاڵ بوونی پیاوانی دینو توغیانی روحی ومالّی وسیاسی وهزریو زانستیان . . بەڵکولەهەموگۆرەپانەکان.

ئەم کاروبارانە کافیە بۆئەوەی ئەو ئەنجامەی لێرە هاتە کایەوە لەوێ جیاوازی هەبێت.

دینی ڕاستی بەسنایی و ساکاری خۆیو دواندنی بۆ هەموو قەوارەی مرۆڤ : بەعەقڵ وروح و لەشی و،گشت گیری بۆ هەموولاینەکانی ژیان جیایە لەو دینە لاڕێبووە ساختەیەی ،کە لاهوت دەیەوێت ئاسانی بکات ،کە لە ئاڵۆزی وناخۆشی نەبێت هیچی تری لێ زیاد ناکات ،ئەمە چ جای ئەوەی یەك لایەن لەلایەنەکانی ژیان دەگرێت ولایەنەکانی تر بەبەتاڵی بە جێ دەهێڵێت.

زانایە شەرع زانەکان ،ئەوانەی مامۆستاو پەروەردەکەرن ئەوجادوگەرە گەوجانە نین ،کە نهێیەکان لە خەڵکی دەشارنەوە، ئەو واقیعە ڕووناکو درێژە ،ئەو واقیعە تاریکە نیە ،کە دە سەدە بەردەوام بوو.

کاتێك موسوڵمانان دەگەڕێنەوە بۆ دینەکەی خۆیان پاش ئەوەی لاڕێیبون لێی هیچ سەیرو سەمەرەیەك لەوە دانیە بەڵکو سەیر لەوەدایە نەگەڕێنەوە لای!

لەگەڵ ڕوونی ئەوجیاوازیانەی هەبوو لە نێوان حالەتی موسوڵمانانو حالەتی ئەوروپا ، ئەوجیاوازیانەی وادەکات ئەنجام لێرەو لەوێ جیاوازی هەبێت, ئەوا ڕابوون لەناکاویەکی توند بوو بۆ زۆربەی خەڵکی! چونکە ئەوانە تەنها تەماشای فاکتەرەکانی داڕمانیان کرد،کە بڵاوکرا بۆوە – کە یەکەم جار لە ئەوروپا تاقی کرایەوەو بەروبومی خۆی دا – واگومانین برد – کەلەخودی خۆی کافیە بۆ لەناو بردنی هەموو دینێك لە بووندا!

بڵاوکردنەوەی ئەو بیردۆزە زانستیە ساختانەی ،کە دژایەتی دینو ڕەوشتو نەریتەکانی دەکردو، کۆمەڵگایەکی دا دەمەزراند ،کە مومارەسەی دین لە نێوی دا نەکرێت لە واقیعی ژیانو ، جلەوی بەربەرەڵلا دەکرد بۆ شەهەوات بۆ ئەوەی وزەو تواناو کارە گرنگەکانی مرۆڤ لەخۆ بگرێت بۆئەوەی خواو دوارۆژەکەی لەبیربکاتو هەروا دانانی چەند ڕێبازێکی زانستی بۆ ئەوەی ناوی خواو پێغەمبەرەکەی – صلی الله علیه وسلم– لەناو نەهێنرێو بڵاوکردنەوەی چەند ڕێنماییەك لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن بۆ خەڵکی لەبارەی خۆشیو لەزەتەکنی دونیا بۆ ئەوەی بیان خافلێنێ لە ڕۆژی دوایی .. ئەمانە هەمووی لەبۆ چوونی – پیلان گێڕەکان – کەفیل بوون بۆ ئەوەی تۆی دین لەدەرووني

موسوڵمانانندا لەناو بباتو، لە کەلەپورو نەریتەکانی دەریان بێنیٚ بەبیٚ گەڕانەوەی جارێکی تر!

بەڵام لەڕاستیەك نەگەیشتن ،کە دوایی بەڕوونی بەدیارکەوت ، ئەویش ئەو تۆیە ژەهراوییەی هاوێشتیان بۆ ئەوەی ڕەگو ریشاڵی دین بخوات ئەوا زۆر لەخاکی ئیسلامی قووڵ نەبۆوە هەروەکو ، کە پێشتر لەخاکی ئەوروپیەکان قووڵ ببۆوە ، بەهۆی ئەو جیاوازیە زۆرانەی لێرەو لەویٚ داهەبوون!

ئەمەش بەتەنها ئەو هۆکارانە نەبوون .. ئەگەر چی ئەمە یەکێکیان بوو – هەروەکو ،کە پێشتر باسمان کرد– کەفیل بوو بۆ ئەوەی ئەنجامەکان جیاوازی هەبێت لە نێوان ئێرەو ئەویٚ.

چەند هۆکارێکی تریش هەبوو،کە بووە هاوڕێی خەڵکی لەناو سەرگەردانی بەڵام لەوکات ئاگاداری نەبوون .. پاشان بەئاگاهاتنەوە !

بەڕاستی ئەو سیستمە هاوردانەو،ئەو سەرکردانەی ئەوسیستمانەیان هاورد کرد سەرنەکەوتن لە چارەسەرکردنی یەك گرفت لە گرفتەکانی ئوممەت ، سەرەڕای ئەو هەموو پڕو پاگەندەی دەکرا، سەرەڕای ئەو هەموو هێزو توانایەی دۆڵ لێدەرو شمشالٚژەنەکان سەرفیان دەکرد . !

بەرەو پێش چونەکی ڕوڵەتی لە هەندێك کاروباردا بەدیکرا. . بەڵام وەنەبیٚ ئەو فەشەلانە لەکاروبارەکانی تردا بشارێتەوە. .

سەربازەکانی دوژمن دەرچوون ، بەڵام دەسەڵاتی سیاسیو ئابووریان دەرنەچوو ، لە هەندێك بواریشدا زیادی کرد !

خەڵکی لە قوتابخانەکانو زانکۆکان چەند توێکڵێك لە زانست فێربوون ، بەڵام کەلێنی زانستیو تەکنەلۆژیا لە نێوان ئەوان و ڕۆژئاوا کەمی نەکرد. . لە هەندێك بواریشدا بە چەند جارە زیادی کرد !

چەند لەشکرێکی نویێ دامەزرا ،بەڵام چەكو تەقەمەنیەكەی بەدەستی رۆژئاوابوو، هەرئەو بڕیاری چەندیەتی وچۆنیەتی دەدا، ئەوەندەی نەدەدانێ بۆ ئەوەی هێزێکی ڕاستی پێدابمەزرێ ،بەڵکو ماڵو سامانی موسوڵمانانی دەفەوتاندو ،بۆ خۆشی پارێزگاری لە پێشکەوتنە زەبەلاحەکەی دەکرد!

شوێنی پێشانگاکان پڕبوونو ماڵەکان پڕبوون بەو شتومەکە هاوردکراوانەی،کە ماڵی موسوڵمانان خەرج دەکات لەگەڵ کەلوپەلەکانی ڕابواردنو خۆشگوزەرانی ، بەڵام دربارەی وەبەرهێنی پیشەسازی ،کە ئابووری دەوڵەمەند دەکاتو وادەکات خەڵکی لەمەڕ هاوردکردن پێویستیان پێی نەبێ ،ئەوا شتێکی زۆر زۆر دوور بوو! بەڵکو زیاتر باری ئابووری تێکداو ،دراوەکانیش دابەزینە خوارەوە!

ڕەوشتیش گەندەڵ کرا .. نەك تەنها لە بواری سێکسی هەروەك ،کە باسی ڕەوشت دەکرێ یەکسەر ئەو مەسەلەیە دێتە هۆشو بیر..بەڵکو لە بواری بەهاکانو پێوانەکان ، بەها ماددیەکان وایان لێهات زاڵ بوون بەسەر ویژدانی خەڵکدا، دوو ڕووییو گەیشتن بەئامانج بەهەر هۆکارێك بێت بووە دراوێکی پاڵپشت کراو لەناو کۆمەڵگاو ،کاروباری خەڵکیش وای لێهات بەڕەشوە نەبایە بەڕێوە نەدەچوو، خیانەتیش بوو بە بنچینەو دەست پاکیش هەڵاوێر کرا!

لەکۆتایش سەربازهاتن بۆ ئەوەی هەر جۆرە خێرێك لە دەروونی خەڵك ماوە بیسوتێننو وەکو شەیتانەکان تۆی شەڕو شۆڕ بچێنن.

لەسەروی هەموو ئەوانەشەوە فەلەستین فەوتاو لەدەست درا. .

هەندێك خەڵك وا مەزندەیان کرد ،کە ڕابوون تەنها کاردانەوەیەك بوو بۆ ئەو سەرنەکەوتنو تێکشکانەی لەهەموو گۆڕەپانەکان ڕوویدا.. سەرنەکەوتنی

سیستمە هاوردکراوەکان ئەو سەرکردە ساختانەی لەپێش چاوی ڕۆژئاوادا دورست ببوونو ،دانرابوون بۆ ئەوەی وڵاتانی ئیسلامی تێکدەنو گەندەڵ بکەن.

کەس نکۆڵی لەوەناکات ،کە ئەو سەرنەکەوتن و تێك شکانانە بوو بووبە هاندەرێکی ئەو ڕابوونە . .

بەڵام خەڵکی لە بیریان کرد،کە ڕەگو ڕیشالی حەقیقی بۆ ئەو ڕابوونە ئەوا پێش هاوردکردنی سیستمەکانو سەرنەکەوتنی سەرکردەکان بوو .

بەڕاستی ئەو بزاڤەی شێخ محمدی کوڕی عبد الوهاب پێی هەڵسا بۆ ڕاست کردنەوەی عەقیدە هاندەرێكو هۆیەکی حەقیقی بوو بۆ بێدار بوونەوەی جیهانی ئیسلامی ، سەرەڕای ئەو هەموو وزەو کۆششەی کرا بۆخەفەکردنو لەناو بردنی .

بەڕاستی – ماوەیەك لەماوەکان – بەدەرکەوت ،کە بانگەوازەکە گەماڕۆدراو پەنجەرەکانی لەسەر داخراو نەی توانی درێژ ببێتەوە . .بەڵام وەنەبێ بانگەوازەکەی شێخ محمدی کوڕی عبد الوهاب هەر لە ناو دوورگەی عەرەبیدا بێت هەتا پەنجەرەکانی لەسەر دابخەنو بیشارنەوە . .بەڵکو ئەمە ئەو بانگەوازەیە ،کە خوای گەورە دەربارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ﴿٢٥﴾ ﴾ إبراهيم: ٢٤ - ٢٥: نەودی خودا چلۆن مەسەل دێنێتەوە ؟قسەیەکی بەڕێوجێ،بەشەنگەدارێك دەشبهێ،ڕەگی قایم داکوتاوەو لقی لەتەشقی ئاسمانە .بەئیزنی ڕاهێنەرەکەی خۆی چوار فەسلە میوەی دەبێ.

بانگەوازێکە درێژ دەبێتەوە بەوەی خوای گەورە لەناوی داناوە لە هەق‌و هێزو ڕوون کردنەوە ،کە دڵێکی باوەڕدار هڵیدەگرێت‌و لەناوی دادەگیرسێ و ، تیشکدانەوەکەی درێژ دەبێتەوەو بەرەو ئاسۆی بەرز دەڕوات . .

کاتێك دژایەتیشی دەکەن کەمێك جوولەکەی ڕادەوەستێ . . بەڵام بەئیزنی خودای باڵادەست دێتەوەو بەروبوومەکەی دەدا .

ڕابوونە پیرۆزەکە هات‌و ئامانجەکەی دەرهێنانی خەڵکی بوو لەوسەرگەردانیەی ,کە لەناویدا خنکابوون بۆئەوەی بیانگەڕێنێتەوە بۆ– ئەو ڕێگایەی سەرگەردان بوون لێی لەسەرەتای سەرسام بووندا.

بەڵکو هات بۆ ئەوەی ئەو تاریکی‌و لێلیەی کەوتبوە سەریەك لای بدات لە ڕێگای بانگەواز پێش دۆڕاندن‌و پێش سەرسام بوون .

هات بۆ ئەوەی دین بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو بێگەردیەی یەکەم جار هاتەخوار ، بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوە بێگەردەکانی: پەرتوکی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی – صلی الله علیه وسلم– و سیرەی پێشینانی چاك .

هات بۆ ئەوەی دین بگەڕێنێتەوە بۆ ژیانێکی واقیعی ، نەك تەنها چەند ویژدانێك بێت لەناو دڵ‌و چەند وشەیەك بێت بەزوبان بوترێ .

هات بۆ ئەوەی نەوەیەك پەروردەبکات لەسەرداخوازیەکانی لااله الا الله .

.

کارێکی قورس و ڕێگایەکی دوورو درێژە . .لەرێگایدا زۆر کۆسپ و تەگەرە هەیە . .

بەڕاستی ئەو کۆسپ و لەمپەرانەی دەوەستێت لەڕووی ڕابوون بەتەنها ئەوجەنگە درەکیە نیە هەروەکو ،کە هەندێك خەڵك وای دەبینن ..

ئەو جەنگە دەرەکیە لەڕاستیدا جەنگێکی دڕندەیە . ئەمڕۆ هەمووجیهان کۆبوویتەوە لەجەنگی دژی ئیسلام : خاچ پەرستانی جیهان بەگشتیو، سەهیۆنیەتی جیهان بەگشتیو، شیرکی جیهان هەمووی ، ئەمە چ جای بەکرێ گیراوەکانی خاچ پەرستو سەهیۆنیەکان لەنێو ولآتدا، ئەوانەی بەئاسن وئاگر دژایەتی بانگەواز دەکەن. .بەبەند کردنو ئەشگەنجەدانو..بەشێواندنی لەڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە..بەهەموو هۆکاری ئەوفرۆفێلانەی ،کەبەمێشك دادێن .

بەلآم چەندکۆسپو لەمپەرێکی تر هەنە زیانەکەی کەمترنیە بۆڕابوونەکە..بەڵکو بۆی هەیە زیانەکەی زۆر زۆرتر بێت لەوجەنگە.

ئەو تەپوتۆزەی پێشتر کەپکەی کردبووە سەریەك لەڕێگای بانگەوازدا پێش داگیرکردنی خاچ پەرستەکان وسەهیونیەکان، لەلارێبوونی عەقیدەو ،لارێبونی بیروبۆچونەکان و .لارێبون لەهەڵس وکەوت وایان کرد ئیسلام لەزەوی خۆی نامۆبێت ، هەروەکو ،کە پێغەمبەر– صلى الله عليه وسلم – هەواڵ پێ داینە ((بدا الاسلام غريبا وسيعودغريبا كما بدأ [1] : ئیسلام بەغەریبی دەستی پێکردو، غەریبیش دەبێتەوە هەروەکو دەستی پێکرد)). تەپوتۆزی داگیرکاری فیکریش هەبوو،کە لەقۆناغی سەرگەردانی خەڵکی گومڕاکردو قووڵ بۆوە بۆ هەموو ئاڕاستەکان.

لەهەست وسۆزی زۆربەی خەڵکیش قورسایی ئەمری واقیع هەبوو،کە وایان دەزانی قابیلی گۆران نیە .

لێرەدا ڕابوون تێنەگەیشتنێکی بە تەواوی هەبوو بۆ کارە گرنگەکانیو لەکاروانە درێژەکەیدا ڕێکخستنی نەبوو بۆ (أولويات) ی کارەکانی. . ئەمە چ

(1) اخرجه الشيخان

جای پەرتەوازەیی ئەو کۆمەڵانەی ،کە بە کاری بانگەواز هەڵدەستان و دژایەتیو دووبەرەکی لەنێوانیاندا هەبوو سەرکردایتیەکی گەورە نەبوو بۆ ئەوەی ئەو یەك ریزیو یەکگرتنە کۆ بکاتەوەو سەرکردایەتی کاروانەکە بکات.

بەڵام ڕابوون – سەرەڕای ئەم هەموو شتانە – بەهێزو توانایەکی زۆر ڕاپەری و هەڵسا.

کەمترین شت لاوانی ڕابوون لەڕاستی ئەو هێلە پانانە تێەگەیشتن بۆ ڕاستی گیروگرفتەکەو ڕاستی چارەسەریەکە . . ئەوەی بەسەر جیهانی ئیسلامی دا داهات لە چەق بستنو بێهێزیو دواکەوتنو بەرتەنگ بوونەوە ئەوا لەئەنجامی دەست پێوەگرتنی دین نەبوو هەروەکو ،کە هەندێك وا گومانیان بردو ،خەڵکێکی زۆریش لە ماوەی سەرگەردانی باوەری پێکردن! بەڵکو دوور کەوتنەوەی خەڵکی بوو لە ڕاستی و دورستی دین!

چارەسەریەکە فرێدانی دینو بەدواکەوتنی رۆژئاوا نەبوو لەو ڕێچکانەی بۆی چوو.. بەڵکو چارەسەریەکە گەڕانەوەبوو بۆ دین! ئەو مەسەلەیە – کەمترین شت بە شێوە پانو پۆڕیەکەی – وای لێهات بوو لەلای ڕابوونی ئیسلامی بە تەواوی ڕوونو ئاشکرابوو ، هەر لە خودی ئەویش تەشەنەی کردو پەڕیەوە بۆ کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵکی ،کە باوەڕیان بە قسەکانی داگیرکاری فیکری و بانگخوازی عەلمانیو،بانگ خوازی ڕووناك کردن لەسەر ڕێبازی رۆژئاوا نەدەکرد ،بەڵکو گوێی خۆیان لەئاست لادەداو بەرەو بانگەشەو هاواری ئیسلام دەچوون ، سکاڵای ئەمانەش ئەوەبوو،کە کیتابی ئیسلامی بەبرەو ترین کیتاب بوو لە بڵاوبوونەوەدا ،وانە ئیسلامیەکان وتارە ئیسلامیەکان لە هەموو شوێنێك دا چڕترین کۆبوونەوەی بە خۆوە دەبینی!

لاوانی ئەم ڕابوونە بەباشی تێگەیشتن ،کە ئەو لااله الا الله یەی بەرەو بەهەشتت دەبات‌و واقیعە لاڕێبوەکەی پێدەگۆڕدرێ‌و واقعێکی ،کە خۆمان دەمانەوێ پێی دادەمەزرێ , ئەوا بەتەنها وشەیەك نیە بەزار بگوترێ! بەڵکو وشەیەکە لەگەڵ ئەو یەقینەی دڵەکانی پڕکردوەو کردەوەیە بە داخوازیەکانی لااله الاالله.

لاوانی ئەم ڕابوونە تێگەیشتن ،کە پەروەردەکردنی ڕۆح فەرزە بەڵام ، نەك لەسەر ئەو پاکیگارە روحیە بەگومانەی ،کە ویژدانی دینی بەرکادێنێ بەبێ ئەوەی بیگۆڕێت بۆ کردەوەو جیهادکردن بۆلابردنی ئیشی خراپ و کردنی ئیشی چاك لە جێگای خۆی.

ئافرەتی موسوڵمانیش لەزۆربەی جیهانی ئیسلامی تێگەیشت ،کە حیجاب بەشێکە لە دینەکەی بۆیە پابەندبوو پێی، سەرەڕای ئەم هەموو پڕوپاگەندەیەی دەکرا لە دژی ، سەرەڕای پڕوپاگەندەی دژو پاڵنەری دژەکە ،کە بانگخوازی داکیر کاری فیکری‌و پیاو ئافرەتە لەدین داماڵراوەکان پێی هەڵدەستان ، ئەوانەی لەناو قوڕی ڕەشدا خنکابوون.

لاوانی ئەم ڕابوونە تێگەیشتن ،کە ئەو ڕۆشنبیرە ژەهراویەی لەمیدیا جیاجیاکانی ڕاگەیاندنەوە پێشکەشیان دەکرێ ئەوا ئەو زادو توێشوە باش‌و چاکە نیە بۆ ئەوەی چەند نەوەیەکی ئیسلامی پێدابمەزرێ،بەڵکو هەر دەبێ ڕۆشنبیریەکی ڕەسەنی ئیسلامی هەبێت ،کە لە ڕێبازەکانی دا پشت ببەستێت بە بیرو بۆچوونە ئیسلامیەکان نەوەك پشت ببەستێت بەبیرو بۆچوونەکانی نەفامی سەردەم . ئەوەی بە سیفتەکی گشتیش ناونراوە زانستەکانی کۆمەڵایەتی ،بەتایبەتیش زانستی پەروەردەو دەروون‌و زانستی کۆمەڵناسی ، ئەواچەند زانستێکی بابەتیانە نیە بۆ ئەوەی ئەو بڕیارانەی لەسەری دراوە ببێتە

شتێکی جێگیر هەروەکو ،کە داگیرکاری فیکری هەوڵیدا خەڵکی وا تێبگەیەنێ ، بەڵکو چەند بیروڕایەکە دەربارەی کاروبارەکانی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤایەتی، کە لەسەرەتادا هەلوێستی خاوەنەکانی لە بارەی خوایەتی خوا یەك نەبوو جیاواز بوو ، هەروا بیرو بۆچوونیان دەربارەی سروشتی پەیوەندی لە نێوان گەردوون و ژیانو مرۆڤ و لەنێوان خوادا ،کە بەدیهێنەری گەردوونو ژیان و مرۆڤە یەك نەبوو . پاشان ئەوەی لەو زانستانەوە دێت لەلای رۆژئاوادا ئەوا بەو روحە هلگەڕاوەیەی لەسەر خواهەیەتی پۆخڵەواتە ،کە زاڵە بەسەر ئەو گەلەی لەوێ دان هیچ مەسەلەیەکی جێگیری لێ وەرناگیرێت ، بەڵکو هەردەبێ لەو هەموو زانستانەوە بەدیلێکی ئیسلامی هەبێت .

هەروەها لاوانی ئەم ڕابوونە تێگەیشتن ،کە ئەو ئابوریەی بە سوو هەڵدەسوڕێ ئەوا حەرامەو هیچ گومانی تێدانیە ، با هەرچەندە– ساختە چیەکان ساختەتەیی بکەن لەبەڵگەو بەهانە هێنانەوە بۆی ، ئەوسووە نیشانەیەکی نەنگە لە نێوچەوانی موسوڵمانان کاتێك بەکاری دەهێننو، هەر دەبێ هەوڵ بدرێ بۆ دیتنەوەی بەدیلێکی ئیسلامی لە بواری ئابووری دا . .

پێش هەموو ئەوانەوە لاوانی ئەم ڕابوونە تێگەیشتن ، کە حوکم کردن بەوەی خوا هەناردویەتیە خوار پەیوەستە بە بنچینەیەکی ئیعتیقادی ،کە ئێمە ناتوانین موسوڵمان بین ئەگەر رازی بووین بە تەشریعێك جگە لەخوا حەلال و حەرام بکا.

ئەو بڕیار لەسەردراوانە هەمووی هاتە ناو خەڵکیو بەچەند هەنگاوێکی جێگیر بڵاوبوویەوە ، سەرەڕای ئاگرو ئاسن .. سەرەڕای دەربەدەرکردنو ئەشکەنجەدان . . سەرەڕای فشاری ڕاگەیاندن ،کە بە توندی کەوتبوە سەر ئەو بڕیار لەسەر دراوانە. لێرەدا بواری درێژە پێدانی ئەوەی ڕابوون پێی

هەڵساوەو پێی هەڵنەستاوە نیە. . بەڵکو باس کردنی ئێمە لێرەدا دەربارەی خودی دیاردەکەیە . . دیاردەی ڕابوونەکە . .

ئەوەیە – ، کە هەروەکو بەردەوام دیلێین – گەڕانەوەیانە بۆ ئەو خورپەو ترپە سروشتیەی ئەم ئوممەتە . بۆیە لامان سەیر نیە ، کە ئوممەت گەڕایتەوە بۆ خورپەو ترپە سروشتیەکەی ، بەڵکو سەیر لەوە دایە ، کاتێ لە کاتەکان لێی لادابوو .

بەڕاستی ئیسلام دینی فریشکە ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الروم: ٣٠ تۆ هەر ڕوو لەم دینە بکەو هەر بەرەو هەق هەنگاو بنێ، دینێکی بنەڕەتیە و لەسروشتدا خوا ئەو خەڵکەی هەر بۆیەکتاپەرستی وەدی هێناوە . کاری خوداش گۆرانی بەسەر دانایە دینی پتەووپایەدار هەرئەمەیە"بەلامزۆربەی ئاپۆڕەی مەردم نەزانن .

باهەر هۆکارێکێك بێت ،کە لە ڕابردوودا وای لەخەڵکی کرد لەڕێی ڕاست لابدەن [1]، ئەوا بەڕاستی ئەو ڕابوونە هات خەڵکی بگەڕێنێتەوە سەر ڕێگا.

ئەم ڕابوونە بەقەدەرێکی خوایی هات ،کەبۆی دانابوو،هات بۆئەوەی خەڵکی لەخەوەکەیان بەئاگابێنێتەوەو , لە سەر گەردانی دەریبێنی بۆ ئەوەی جارێکی تر کارەکەی بگرتەوە دەست .چونکە خۆری شارستانیەتی ڕۆژئاوا زۆری نەماوە ئاوابێ ..

(1) کۆمەڵێك لەو هۆکارانەم باس کردوە لە کیتابی واقعنا المعاصر بەشی خط الأنحراف وبەشی آثار الأنحراف.

بەڕاستی ئەمە ڕووداوێکی مێژووییەو ، چەند دێرێکی پەرشو بڵاو نیە لەلاپەرەکانی مێژوو . .

ئێمە مژدە دەرین بەو ڕابوونە سەرەڕای ئەم هەموو ساتمانەی ، سەرەڕای ئەم هەموو کۆسپو تەگەرانەی لە رێگایدا دانراون . .سەرەڕای زانینمان بە دووری ڕێگاکە ،کە هێشتا لەسەرەتای ڕێگادایە !

ئەم ڕابوونە – بە حەول و قوەتی خوا – بەهێزترە لە هەموو ساتمەو کۆسپ و تەگەرەکان . .

ئەوجەنگەی کرا سەر ڕابوون ئەوا نەدەکراسەری‌و، جیهانی خاچ پەرست وسەهیۆنیەتیش بەوشێوە دڕندەیە کۆنەدەبۆوە هەروەکو ,کە چەند نمونەیەکمان لێ دیت لە بۆسنەو هێرسك ئەگەر ئەم ڕابوونە شتێکی ڕاست نەبایە و خۆی نەنواندبایە لەجیهانی واقیعداو مژدەی شتی زیاتری نەدابا..

بەڕاستی دوژمنان هەقیقەتی ئەم دینە دەزانن ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ﴾ البقرة: ١٤٦: ئەهلی کتێب – وەکو کوڕانی خۆ – ئەم پێغەمبەرە دەناسن .

دەزانن ،کە ئەگەر زیندووبۆوە لەدەروونەکان ئەوا دەتوانێ زۆرانبازی بکات با هەر چەندە دوژمنەکانی هێزیان هەبێت‌و. . دەتوانێ لەپاش ئەمە جێگیر ببێ بەوەی خوا لە ناوی داناوە لە هێزی هەق و،رەصیدی فریشك‌و قوڵایی یەقین .

ئەمەشە،کەموژدەی پێدەدەین‌و پێش بینی دەکەین لە بەیانیەکی بە ئومێد هیوا .

# بەیانیەکی بە ئومێدو هیوا

ڕێگا بۆ بەیانیەکی بەهیوا بەگوڵ وگوڵزارفەرش نەکراوە. .بەڵکو بەدڕكو ئێش‌وخوێن فەرش کراوە..خوێنی ئەوشەهیدانەی لەڕێگا دەکوژرێن. .

بەڕاستی ئەمڕۆ هەمووجیهان موکڕە لەسەر سڕینەوەی ئیسلام لەزەویدا.

دوژمنان ئەوەجاری یەکەمیان نیە،کەموکڕن لەسەر ئەم هەولآنە لەوکاتەی محمد– صلی اللەعلیە وسلم– بویتە پێغەمبەر هەتا ئەم ڕۆژگارە,خوای گەورە پێش چواردە سەدەو هەندێك وتەی خۆی هەناردۆتە خوار لەم بارەیەوە ،کەدەفەرموێ : ﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾ الصف: ٨ گەرەکیانە تیشکی خودا هەر بەفوی دەم وەکوژێنن . خواش تیشکی خۆی هەر سەر دەخا ، با خودا نەناسانیش خۆشیان نەیە .

﴿یریدون أن یطفئوا نور الله بأفواههم ،ویأبی الله الا أن یتم نوره ولو کره الکافرون : دەیانەوێ بەفوی دەمیان ،تیشکی ڕۆشنایی خوا وەکوژێنن ،خوداش خۆی بڕیاری داوەکە ئەم تیشکەی هەر سەر کەوێ جا با خوانەناسانیش حەز نەکەن﴾ سورەتی توبە :32

لەو هەردو ئایەتەکە (ضمیر) دەگرێتەوە بۆ خودی ئەو دوژمنانەی ئەمڕۆ دەیانەوێ تیشکی خودا بکوژێننەوە : لە جوولەکەو فەلەو موشریکەکانو، ئەودووڕوانەی ، کە بەکرێ گیراویانن ﴿ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ ﴿١٢٠﴾ ﴾ البقرة: ١٢٠ ئەم جوولەکەو فەلانە ، تا نەچیتە سەردینی ئەوان ، هەر گیزخۆشیان لە تۆنایە ) سورەتی بقرە : 120 .(ولا یزالون یقاتلونکم حتی

يردوكم عن دينكم ان استطاعو: ئەوان دەستو لێ بەر نادەن ،هەر لەگەڵ ئێوە بەشەڕ دێن هەتا – بۆیان بلوێ – ئێوە لە دینەكەی خۆتان وەربگێڕن.

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المجادلة: ١٤ : ئاخۆ تۆ ئەوانەت نەدیت كە بوونە دۆستی ئەوانەی خودا غەزەبی لێگرتوون ؟ لە ئێوەنین ،بە درۆ سوێند بە خوا دەخۆن وەدەشزانن كە درۆدەكەن.

بەڵام لەوانەیە جیاوازی لەنێوان هەوڵدانەكانی ئێستاو هەوڵدانەكانی پێشو ئەوە بێت ،كە لە هەوڵدانەكانی پێشو لەیەك كاتدا هەندێك لە دوژمنان هێرشیان دەهێنا سەر چەند پارچەیەك لەجیهانی ئیسلامی . بەڵام لەم جارەدا هێرشەكە لەلایەن هەموو دوژمنان لەیەك كاتدا كراوەتە سەر هەموو جیهانی ئیسلامی .

جیاوازیەكی تریش ،كە لەوانەیە هۆیەكی تەواو بێت بۆ بوونی جیاوازی یەكەم .. ئەویش جیهانی یسلامی – بە تێكرایی– لە هیچ كاتێك وەكو ئێستا ئەوەندە بێهێزو لاواز نەبووە . .

لەوانەیە ئەو هێرشە دڕندەیە جێگای سەرسورمان بێت لەگەڵ لاوازی و بێهێزی جیهانی ئیسلامیو خۆ تەسلیم كردنی لەوەی ،كە دەیانەوێ لەلایەنی سەربازیو سیاسیو ئابووریو هزری لەگەڵی دا بكەنو ، دەستەو سانیشە بۆ بەر پەرچ دانەوەی ئەو لێدانانەی ،كە لەڕاستو چەپەوە ئاڕاستەی دەكرێ.

بەڵام لەوانەیە كاتێك هۆكارەكان بزانی سەر سوڕمانیەكە نەمێنیٚ . .

لێرە بەلایەنی كەم دوو هۆ هەنە بۆ ئەو هێرشە دڕندەیە ،كە هەموو دوژمنانی ئیسلام شانەو شان ئاڕاستەی دەكەنە سەری ، هەتا ئەوانەی

دوژمنکاریەکی توندیان لەنێوان دا هەیە وەکو نێوان سربو کروات ئەوا لەسەر هیچ شتێك بەیەك ناگەن . . تەنها دژایەتی ئیسلام نەبێت!

هۆی یەکەم دوژمنانی ئیسلام ئەوانەی لەماوەی دووسەدەی پێشوو پیلانیان گێڕا دژیو نەخشەیان کێشاو زۆر بەوردی و تۆکمەیش جێبەجێان کرد ،ئەوە واگومانیان برد ،کە نەخشەکەیان بەتەواوی و بەیەك جاری کۆتایی بەئیسلام دێنێت و ئەوان هەتا هەتایی لەدەستی ئەو دوژمنە دەحەسێنەوە ،کە لەمیانی مێژوودا سەریانی ئێشاندوە .لەناو بردنی دەوڵەتی عوسمانیو،تەفروتونا کردنی پاش ماوەی پیاوی نەخۆش بۆچەند ولاتۆکەکی چروکی بێهێزی هەژار لەسەرو هەموانیش دژ یەکو ڕق لێك هەستاو ،ئەوە گورەترین سەرکەوتن بوو,کە لە هەموو مێژوودا لەسەر ئیسلام بەدەستیان هێنا ،جا دەستی خۆیان داوەشاند لەخۆشی سەرکەوتنیانو،دانیشتن بەروبوومەکەیان لێدەکردەوە. .

بەڵام لەناکاو ڕابوون قیت بۆوە!

وەنەبێ لەبیرو هەستیاندا ڕوودانی بێداربوونەوە نەبووبێ، بەڵکو شوێنێکی ڕوونو بەرچاوی لەنەخشەکانیاندا هەبووە .

لەساڵی1907 ز ڕاپۆرتێکی لۆرد کامبل دەرکەوت . کە یەکێکە لە لۆرداتی بەریتانی ،کە ئەو کات بەریتانیای عوزما بوو ،کە ڕای سپارد بۆ ئەوەی لێکۆلینەوەیەك بکات لەدیاردەی بەدیار کەوتنی بێداربوونەوە لەو ناوچە عەرەبیەی ،کە لەناو جیهانی ئیسلامی دایەو بوویتە مایەی دڵەڕاوکێ بۆ دەوڵە ئیستیعماریەکان . جا هەڵسا بەو کارەو لێی کۆلیەوەو ڕاپۆرتەکەی ئاڕاستەی هەموو دەوڵەتە ئیستیعماریەکان کرد،بەتایبەتی بۆ بەریتانیاو فەرەنساو بەوەسفەی ،کە چاودێری سەرەکینە بەسەر بەشی عەرەبی لەجیهانی ئیسلامی

،جاوتی (لێرەدا یەك گەڵ هەیە نیشتەجێنە لەکەنداو تا زەریا ،زمانەکەیان یەکەو ،دینەکەیان یەکەو ،زەویەکەی پێکەوە لکاوەو،مێژوەکەی پێکەوە بەستراوە . ئێستا لەناو چنگی ئێمە دایەو بەڵام وادەستی کردوە بەجولەجول و ئەم لاو ئەولادەکات ، بەیانی چیمان بسەر دێت ئەگەر عیملاق بێداربۆوە ؟) پاشان وەڵامی پرسارەکەی دایەوە بۆئەوەی ((لایەنی پەیوەندی دار )) دڵنیا بکات و وتی: (ئێمە پێویستە پەیوەندی ئەو گەلە لەگەڵ یەکتری بپچڕێنین بەدورست کردنی ولاتێکی تر ، کە دۆستمان بێ ودوژمنی خەڵکی ناوچەکە بێت ، وەکو دڕکێك وابێت ،کە هەرکاتێك عیملاق ویستی هەربستێتەوە لەپێی ڕابچێ ! ! )[1]

ئەمەیە ئیسرائیل . .پیلانێکی خاچ پەرستی سەهیۆنی ڕوون و ئاشکرا دژی ئیسلام . .

بەڵام (( لایەنی پەیوەندی دار)) بەتەنها وازیان نەهێنا لەڕووبەڕو بوونەوەی ئەو ڕابوونە پێش بینی کراوەی ،کە ((کامبڵ)) گوزارشتی لە بارەیەوە کرد بەوەی وا عیملاق دەستی کردوە بە (جولە جول و ئەم لاوئەولا دەکات) بەڵکو چەند پێشەواو چەند سەرکردەیەکیان پەروەردەکرد بۆ ئەوەی کاتێك تورە بوون و ڕق و قین ڕوودەدەن بتوانن هەمووی لەخۆ بگرن و پاشان لەکۆتایدا بیگۆڕن بۆ کەف بۆ ئەوەی لەسەر ڕوو بڵاو ببێتەوەو پاشان دوای ماوەیەك لابچێت بێ ئەوەی هیچ شتێك لەسەر ڕوو بەجێ بهێڵێت ! ئەمە سەرەڕای ئەم ڕێو شوێنانەی ،کە دەگیرا بەر وەکو یەدەگێك ! چەند پێشەوایەکی سیاسیو سەرکردەیەکی گەڵ کەش و هەوای پڕکردبوو ،پاشان

---

(1) بگەرێوە بۆ راپۆرتەکەی لۆرد کامبل لە بلاکراوەکانی زانکۆی عەرەبی لە قاهیرە

لەکۆتایدا زەرەری بەرژەوەندیەکانی لایەنی پەیوەندی داری نەبوو, بەڵکو زیاتر دەیچەسپاند ،گەلەکانیش بێئاگانو چەپڵە لێدەدەن بۆ سەرکردە پاڵەوانەکانی لەکاتێك وڵاتەکەیان بەرەو دارمان و رووخان دەبەن!

بگرە لە تەنیشت ئەوەش سینەماو شانۆو ئێزگەو( لەوکات هێشتا تەلەفزیۆن بەدیار نەکەوتبوو) رۆژنامەو بەرنامەکانی فێربوون و . . رزگارکردنی ئافرەت! [1]

لەگەڵ هەموو ئەمانەش رابوون هەر هاتەکایەوەو سەری هەڵدا.

چی پێش بینی دەکەی بۆ ئەوانەی نەخشەیان کێشاو، وا گومانیان برد ، کە نەخشەکانیان کۆتایی بە ئیسلام دێنێت و جارێکی تر گەرانەوەی نابێت؟!

هەرچی هۆی دووەمە – کە بەهەمان شێوە پیوەستە بەرابوون – ئەوا هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا– زانینیانە بە راستیو دورستی ئەم دینەو هەروا، زانینیانە، کە ئەگەر ئەو رابوونە لە دڵەکان جێگیر بوو ئەوا هیچ شتێك ناتوانێ بیوەستێنێ هەتا نەگاتە مەدای خۆی . .

لەم دوو هۆیە پێکەوە: وەرسیو بێزاریان لە بودەڵ بوونەوەی نەخشەکانیان ماوەی دوو سەدە زیاترو، سەخڵەت بوونیان لەو بەرژەوەندیانەی کە رابوون هەرەشەی لێدەکات ئەگەر بەردەوام لە رەوتی درێژ بوونەوە دابێت ، ئەوا دەتوانین لەو هەڵوێستە هارو دژوارە بگەین ، کە لە زەوی دا بەرێوە دەچێ بۆ لێدانی بزاڤی ئیسلامی.

ئەگەر بێتوئەو بەرژەوندیانە رەوا بووانەو مەعقول بان ئەوا نەدەبا لەهیچ شتێکی ئەو ئیسلامە بترسابا، چونکە هەر ئیسلامە فەرمانی بە دادگەری کردوە

---

(1) فراونتر باسمان لەم کارووباراندا کردوە لە کتابی واقعنا المعاصر لا 215 – 263

لەگەڵ ئەهلی كیتابو ، خوای گەورەش پێغەمبەرەكەی ڕاسپاردوە بۆ ئەوەی پێیان بڵێ ﴿ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ﴿١٥﴾ ﴾ الشورى: ١٥: بێژە : من بە هەر كتێبی خودا ناردویتە خوارێ ،بڕوام هەیە ، فەر مانیشم پێدراوە ، بەیەكسانی بە كاروبارتان ڕابكەم ، ئێمەو ئێوە خوا پەروەرندەمانە ، كردەوەی خۆمان بۆ خۆمان ،كردەوەی خۆتان بۆ خۆتان .

بەڵام ئەو بەرژەوەندیانەی،كە هەندێك جار ڕایدەگەیەنن و هەندێك جار دەیشارنەوە ئەوا نایەوێت هیچ ئیسلامێك لە سەر زەوی بێت .. بەڵام لەپشتیەوە مەشیئەت و ویستی خودا دەوەستێت . ﴿ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ التوبة: ٣٢: خوداش خۆی بڕیاری داوە كە ئەم تیشكەی هەر سەركەوێ جا با خوانەناسەكانیش حەز نەكەن.

ئەگەر بێتو لە نهێنی شالاوە دڕندەكە گەیشتین‌و لەو موكوریە گەرم وگوڕە گەیشتین،كە ئاڕاستەی بزاڤە ئیسلامیەكان دەكرێت بۆ لەناو بردنی ،ئەوە لەبەیانیەكی نزیك یان دوور چی پێش بینی بكەین لەكارو بارەكەی؟

بەڕاستی پێش بینی هەموو خێرێك دەكەین . . !

نالێین ئەمە بەڕاست زانینمانە بۆ ئاواتەكانمان ! بەڵكو متمانە بە بڵێنی خوا دەیلێین و،لەسەر تیشكی ئەو سوننەتانەی خوا هەڵیدەسوڕێنێ و هەموو كاروبارەكانی مرۆڤیشی لەزەویدا پێ هەڵدەسوڕێنێ .

هەرچی ڕۆژ ئاوای خاچ پەرست و سەهیۆنیەكان‌و بەكرێ گیراوەكانیان ئەوا زۆر بەگەوجاتی‌و گەمژەیی دژی برژیەوەنیدیەكانی خۆیان كاردەكەن !

ئەوانە بەو هەلویستە هارو دژوارەی مومارەسەی دەکەن بۆ لەناو بردنی بزاڤە ئیسلامیەکان ،نەوەیەك پەروەردەدەکەن ،کە نەتوانن لە ڕووی بوەستن و درەقەتی بێن ! ئەمەش دەکرێت لەبێئاگایی ئەوان و بەتەگبیرەکی خوا بۆی ،هەروەك بلێی قەدەری خوایە دەیان هاژوا بۆ دەرپەڕاندنی ئەو نەوەیە لەسەر دەستیان !

لە ڕاستیدا تەقینەوەکان بەردەوام کاتێك ڕوودەدەن، کە مردن و ژیان لەلای خەڵکی وەك یەکی لێبێت ، یان کاتێك لەلای خەڵکی مردن بۆیان ساناترە لەژیان!

هەموو ئەو تەقینەوانەی ڕووی داوە لەمێژوو لە پێشیدا هەلوێستێکی هارو دژوار هەبووە بۆ لەناو بردنی تەزویەکی سەرکەوتوو کە تاغیەکان گومانیان برد دەتوانن بەزۆریو ئەشکەنجەدان لەناوی ببەن !

ئەوەی ئەمڕۆ لە زەوی دا ڕوودەدات لەو هەولانەی دەدرێت بۆ لەناو بردنی موسوڵمانان ،جا یەکسانە لە بۆسنەو هێرسك بێت ، یان کشمیر، یان فەلەستین ، یان بۆرما ، یان تاجیکستان ، یان لەناو بەندیخانەکانی ئەشکەنجەدان . .ئەوا ئەنجامەکەی تەنها دەبێتە دەرپەڕاندنی چەند نەوەیەکی پشت ئەستورترو ،منجرترو ،پشوودرێژترو،تێگەیشتوتر بۆ ڕاستی ئەو جەنگەی ،کە لەزەویدا ئەخولێتەوە لەنێوان دینی خواو دوژمنانی خوا .

ئەو ئەنجامەش – بێگومان – دژی بەرژەوەندیەکانی لایەنی پەیوەندی دارە!

ئەگەر تێی بگەیشتبانە وایان نەدەکرد (ولو شاء ربك مافعلوه) سورەتی انعام112

بەڕاستی ئیسلام لەهەر ڕێگایەکەوە بێت ئەوە دێت ، هەروەکو ،کە گوتومانە لە کیتابی دروس من محنه البوسنه والهرسك یان بە تەزویەکی نەرم و لەسەرخۆ ، کە کاردەکا بەهێمن و ئارامی بۆ ئەوەی بەکاوەخۆ بگاتە ئامانجەکانی ،یان بەتەزویەکی توڕەو توندو تیژ ، پەنا دەباتەبەر توندیو لەڕێگادا پەلەدەکات.

ئێمەش – هەروەکو گوتومانە لەو کیتابە – تەزووی لەسەرەخۆو نەرم هەزار جار بەباشتر دەزانین ،کە کاردەکات بەهێمن وئارامی ،باتەواو بوونەکەشی چەند نەوەیەك بخایەنێ ! بەڵام چی بکەینو چارمان چیە لەدەست گەمژەیو گەوجاتی ڕۆژئاواو گەمژەیو گەوجاتی ئیسرائیل[1] ؟!

---

(1) کاتێك ڕۆژئاواو ئیسرائیل و بەکرێ گیراوەکانیان لەجیهانی ئیسلامی بەردەبنە گیان موسوڵمانان و ئیسلام بە ئاگرو ئاسن کوشتنو گرتن ودەربەدەر کردن و بێبەش کردنیان بەئەنقەست لە سادەترین مانای ژیان و خۆشگوزەرانی ، هەندێك لە موسوڵمانان بۆ ڕاگرتنی ئەم دەست درێژیانەو بەرپەرچ دانەوەیان و سەندنەوەی مافە زەوت کراوەکانیان ڕێگای توندو تیژو سەخت دەگرنە بەر وەکو مافێکی ڕەوای خۆیان ، کە شەریعەتی زەویو ئاسمانو ڕێگای پێداوە بۆ بەرگری کردن لەخۆیان و دین و ئابڕویان ،جا خودی هەڵبژاردنی ئەم ڕێگایە خەتای ئەوان نیە بەڵکو خەتای هەلوێستی سەخت و دژواری خاچ پەرست و جوولەکەی سەهیۆنیە ، کە مومارەسەی دەکەن بەرامبەر بە موسوڵمانان کورد گۆتەنی : کە جام پڕبوو لەسەری دەرژێ ،بەڕاستی هیچ گەلێك لەگەلانی دونیا پێشوازی نەکردوە لەداگیرکەران بە گوڵ و گوڵ زارو ڕەیحان ئەمە چ جای ئوممەتی ئیسلام کە دینەکەی دینی سەروەری و هێزو جیهادەو هەموو پیلان و نەخشەو دەست درێژیەك لە گۆڕ دەنێت ، کەبیەوێ لەناوی ببات وبیسڕێتەوە ،پاشان ئەو داگیرکەرانە بەخۆیان سەلماندویانە ،کەوەکو گایەکی سەرکەشی ئیسپانی وانە هەتا لەشی بەڕم کون کون نەکەی ڕاناوەستێ لەپەلاماردان و وێران کاری جا بۆ گلەیی بکرێ لە موسوڵمانان لە هەڵبژاردنی ئەم ڕێگایە ! ڕاستە ئەم ڕێگایە لایەنی خراپی لێدەکەوێتەوەو کەمێك زەرەرو زیانی بۆخودی خۆیان و ئوممەت و

ئەگەر بێتو ئەمە حالی دوژمنان بێت . . ئەدی حالی ڕابوون چیە؟

ئەگەر بێتو بگەڕێینەوە بۆ ڕێرەوی ڕابوون – کەهەر دەبێ وەبکەین– دەبینین – هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا– ئەوا هەڵساوە بەکۆششو ماندووبوونێکی زۆر ، شوێنەواری لەسەرگۆرەپان بە ڕوونی دیارە ،بەڵام پەلەی لە هەندێك هەنگاودا کردوە ، سستو خاویەکی زۆریشی لە هەندێك بواردا نواندەو ، هەندێك بواریشی بەجێ هێشتەوە بەبێ ئەوەی کۆششێکی شایەنی بۆ سەرف بکات . .

ئێرە بواری درێژە پێدانی هەموو ئەو شتانە نیە. بەڵام هەردەبێ ئاماژە بەچەند نیشانەیەکی خێرا بکەین بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو شتانەی دەیلێین .[1]

ڕابوون بە کۆششێکی ئیعلامی گەورەوە هەڵسا، سەرەڕای بێ بەش کردنی بەئەنقەست لە زۆربەی دەزگاکانی ڕاگیاندن!

ئەم هۆشیاریو بێداربوونەوەیەی ئەمڕۆ لەلای ئاپۆرەی خەڵك هەیە ، ئەوا – پاش چاکەو فەزلی خوا – دەگەڕێتەوە بۆ ڕابوونی پیرۆزو ، بۆ ئەو کۆششو

---

بانگەواز هەیە ،بەڵام کەسێك بیەوێ بخنکێ دەستی درێژ دەکات بۆ هەموو چیلکە دارێك بۆئەوەی دەستی پێوەبگرێت و ڕزگاری بێت، شاعیردەڵێت : فاذا لم يكن من الموت بدّ فَمِنَ العار ان تكون جبانا : ئەگەر نەتوانی لەدەستی مردن ڕابکەی نەنگە ترسنۆك بی.
ئەم هۆکارانەی ئەمڕۆ موسوڵمانان دەیگرنەبەر بۆبەرگری کردن لەخۆیانو دینو ئابڕویان زۆربەی هەرە زۆری ڕەواو شەرعینە ،ڕێژەیەکی کەم هەنە نامەسئولانەو بێ پلانو نەخشە کاردەکەن بەڵام لەبەر ڕێژە کەمەکەیان ئیوەی نیە هەر ئاماژەشی بۆ بکەین. وەرگێڕ

(1 ) هیوام وایە خوای گەورە سەرکەوتوم بکات یۆ نوسینی لێکلینەوەیك بەناونیشانی كيف ندعوا الناس.

ماندووبوونە بەردەوامەی ،کە بەگەڕی خست لەماوەی نیو سەدە بۆ پێناساندنی ئیسلام بۆ خەڵك.

ئەمەش کۆششێکە هەر دەبێ باسی لێوە بکرێ . .

ئەگەر ئێمە بێتو لەسەدەی ڕابردوو بەحاڵی موسوڵمانان دابچینەوەو ماوەی ئەو غوربەتەی ئیسلامی لول پێچ کردبوو ، هەتا وای لێهات نامۆ بێت لەلای خەڵکەکەیو ، وای لێهات ئەوەی دەستیان پێوەدەگرت ،کە ئیسلامە ئەوە وەکو بلێی دینەکی ترەو ئەو دینە نیە ،کەخوای گورە ناردیتەخوار . . ئەگەر بەو حالە دابچینەوەو جیاوازیمان پێکرد لەگەڵ ئەو ئێستایەی ،کە هەموو گۆڕپانی پڕکردوە یەك سەر لەو کۆششو مانووبوونە تێدەگەین ، کە بانگەواز سەرفی کردوە لەو بوارەدا.

دیار ترین شتیش ،کە ڕابوون لەم بوارەدا پێی هەڵسا کۆشش کردنی بوو بۆلابردنی شوێنەواری فیکری ئیرجائو فیکری سۆفیو ڕاکردن لە ئەرکەکان، یان بەلایەنی کەم سوك کردنی شوێنەواریان بوو. .کە بەڕاستی ئەم سێ شتە توند ترین شت بوون ،کە ئوممەتی ئیسلامیان تووشی بێهێزیو کەنەفتی کرد .

بەهەمان شێوە دیار ترین شت ،کە پێی هەڵسا پێداگرتنی بوو لەسەر مانای لااله الا الله ،کەوشەیەك نیە تەنها بەزار بوترێ , باوەڕیش وتەیەك نیە جیاکراوە بێت لەکردەوە ،هەروەکو پێشینان وتویانە باوەڕ وتەو کردارە . .کردارە بەداخوازیەکانی لاالەالا الله لەواقیعی گەواهی دراودا . . بەڕاستی گەماڕۆدانی باوەڕ لەدرکاندنی لااله الاالله بەزوبان لەلایەك شوێنەوارێك بوو لەشوێنەوارەکانی فیکری ئیرجائو ،لەلایەکی تریش ئارەزووکردنی هەڵاتن بوولە ئەرکەکان . لەلایەنی سێهەمیش ئەو چەواشە کردنەبوو،کەدامودەزگاکانی داگیرکاری خاچ پەرستان وسەهیۆنیەت پێی هەڵسان ،بۆ ئەوەی موسوڵمانان

لەمەڕ حەقیقەتی لاالەالاالله سەرخۆش بکەن و ،لایەن بدەن لەهەر هەوڵێکی جیدی ،کە بیەوێ بیگۆڕێت بۆ واقیعێی زیندووی بزوێنەر هەروەکو ،کە حەقیقەتەکەی خۆی ئەو هایە ،کە لەلایەن خوا هاتۆتە خوار .

یەکێکی تر لەشوێنەوارەکانی ڕابوون لابردنی سەرسامی بوو بەوەی لەلای رۆژئاوادا هەیە ، یان – بەلایەنی کەم– کەم بوونەوەی شوێنەواریان بوو لەسەر گیانی خەڵك . . بەڕاستی ئەم سەرسام بوونە لەتوندترین فاکتەری بەندایەتی کردنی خەڵك بوو بۆ رۆژئاواو سەقەت کردنیان بەوەی نەتوانن هەر بیریش لەبەرگری کردن بکەنەوە هەتا لەناو هزرو هەستەکانیشیان ، ئەمەچ جای بەرگری کردنیان لەواقیعی هەست پێکراودا.

لێرەدا لەشتە بژاردەکانی ڕابوون ئەوەیە,کە بانگەشەی نەکرد بۆداخستنی دەرگاکان لە ڕووی ئەو شتانەی لەلای ڕۆژئاواوە دێن ،بانگەشەی بۆ گۆشە گیری نەکرد لەکاروانی ژیانی زیندوو ،بەڵکو بانگەشەی کرد– لەسەر ڕێنمایی – بە پێویستی هەڵبژاردن بۆئەو شتانەی لەلای رۆژئاوادا هەیەو ،وەرگرتنی هەندێکیان ،کە دەبێ وەربگیرێ و واز لێهێنانی هەندێکیشیان ، کەدەبێ وازی لێبهێنرێ ،هەروا سوود وەرگرتن لەو شتانەی وەرگیراوە بۆمل کەچکردنی بۆ ژێر ڕێبازی ئیسلامی ،نەك ئیسلام بهێنرێتە ژێر باڵی ڕێبازەکانی رۆژئاوا. .

بەهەمان شێوە ئەو شتەی ، کە بۆ ڕابوون حیساب دەکرێ کارە زەبەلاحەکەی بوو لە بواری ئافرەتدا . ,بەڕاستی گۆڕەپانی ئافرەت لە گەورەترین ئەو بوارانە بوو ،کە داگیرکاری فیکری ئیشی لەنێوداکرد ،بۆ ئەوەی کۆمەڵگا گشتی لەئیسلام بێننە دەرەوە . دایك مناڵەکانی لەتەمەنی سەرەتاییاندا تۆی ڕێبیری عەقیدەو ڕێبیری چاکەو ڕێبیری ڕەوشتی لەنێو

دەچاندن ،جا ئەگەر دایك ,کە هێشتا کچە ،حیجابەکەی فڕێداو پەرستنەکانی فەرامۆش کردو سەر جەنجاڵ کرا لەمەڕ خوایو قیامەتەکەی بەبەدواکەتنی مۆدەو کەلوپەلەکانی جوان کاری و دەرچوونی لەماڵ بۆ فیتنەو خۆ ڕووت کردنەوە ، ئەوا کاتێك دەبێتە دایك منالّکانی لەسەر عەقیدەو باشەو ڕەوشتی چاك پەروەردە ناکات ، چونکە کەسێك بەخۆی شتێکی نەبێت ناتوانیٚ ببەخشێت (فاقد الشيْ لايعطية).

بەڕاستی داگیرکاری خاچ پەرستو سەهیۆنیەت لەم گۆرەپانەدا کۆششێکی زەبەلاحیان سەرف کرد ، بەجۆرێك ،کە ئاسان نەبێت بۆ ئافرەتی موسولّمانی پابەند بەحیجاب بژیت لەو کۆمەڵگایە ڕووتو رەجاڵ و هەڵوەشاوەو بەرەللایە ،کە پریەتی لە خراپەو خراپەکاری. . بۆیە ئەمڕۆ بانگخوازی داگیرکاری فیکری بەواق وڕمانو بێزاریەکی زۆر دەڕواننە دیاردەی حیجاب ،کە تەنها کچەکانی زانکۆی نەگرتەوە ،بەڵکو گەیشتە ((ئافرەتەهونەرمەندەکان ))ئەوانەی ,کە پێش بینی دەکریٚ دوایین کەس بن بگەڕێنەوە بۆ لای خوا!

ئەمانە – هەمووی لەپاش چاکەو منەتی خوا– حیساب دەکرێت لەماوەی نیو سەدەدا بۆ کۆشش و ماندووبوونی بانگەواز.

بەڵام بانگەواز لەهەندێك کاروباردا پەلەی کردوە،کەوا گومانی برد لێهاتوە بۆ ئەم کاروبارانە. .

پەلەی کرد لە بەرکەوتنی لەگەڵ دەسەڵاتدا ، پەلەی کرد لە گەیشتن بۆ حوکم .

بەڕاستی بەرکەوتن لە نێوان دەسەڵاتو بانگەوازدا – لەماوەی بیٚ هێزی نابێت لەلایەنی بانگەوازەوە بێت ، بەڵکوبەردەوام لەلایەنی دەسەڵاتەوەیە، کاتێك دەسەڵات لەبانگەوازی ئیسلامی دەدات ،کە هیچ ناکات تەنها حەقیقەتی لاالەالاالله

بۆخەڵكی ڕوون دەكاتەوە ،خەڵكیش – بەگەواهی دەری واقیع – حوكمی ئەم دەسەڵاتە لە ئیسلامداو هەڵوێستەكەشی دەزانن لەمەڕ بانگەوازی لاالەالاالله.بەڵام كاتێك هەلێك دەدۆزرێتەوە بۆڕاكێشانی بزاڤەئیسلامیەكان بۆجەنگێكی بێ چونیەك (غیرمتكافیء) ئەواسەركەوتوودەبێ لەشێواندنی كارەكە لەلایەن ئاپۆرەی خەڵك و وای تێ دەگەیەنێ ،كەئەولەگەڵ ئیسلام داناجەنگێت ،بەڵكولەگەڵ تیژڕەوی وتوندیدا دەجەنگێت . . كە بەمە هۆشیاری وتێگەیشتنی خەڵك بۆ كاروبارەكە دوادەكەوێ، كە ئەمەیان توخمێكی گرنگە بۆ بزاڤەكە و نابێت دەست بەرداری بێت.

بەهەمان شێوە پەلە كردن بۆ گەیشتنە حوكم . . ,كە لەسەرەتا دامەزرا لەسەر هەر خەڵەتان بەگەرم و گوڕی ئاپۆرەی خەڵك ..بەڵام گەرم و گوڕی ویژدان شتێكەو خۆكردنە سەربازی خەڵكی بۆ كاروباری لااله الاالله شتێكی ترەو جیاوازە .. شتێكە پەروەردەكردن دورستی دەكاتو وتارە بەگوڕوتینەكانو كیتابو موحازەرەكان دورستی ناكەن!

پەروەردەكردن ئەو لایەنەیە ، كە دەلێین بەڕاستی ڕابوون سستیو خاوی بەرامبەردا كردوە ،لەگەڵ ئەوەی ، كە شادەمارێكی زیندوە بۆ بانگەواز،كە لەپاش چاكەو فەزلی خوا دەستەبەری جێگیری دڵەكان دەكات لەسەر هەق وبەردەوام بوونی لەسەر ڕێگا .جایەكسانە لەقۆناغی بانگەواز بێت یان لەقۆناغی جێگیر بوون كاتێك خودا بە منەت و میهرەبانی خۆی ئەو جێگیر بوونە دەبەخشێت .

بەڕاستی گەرم و گوڕی بۆ ئیسلام شتێكی جوانە . . گۆڕان كاری دەكات بۆ ڕابوون لەوێنەی گشتی كۆمەڵگادا – بەتایبەتی بۆلاوەكان – لەوێنەیەكی بێئاگای گاڵتەجاڕی هەڵاتووی بەرەڵلای توێنوو لەبەدواكەوتنی بۆڕۆژئاواو،

خنکاو لەناو پیسی بۆچوونەکانو هەڵس وکەوت ، بۆ وێنەیەك ، کە لەنێوی دا پابەندبوون و پەرستن هەیەو خۆسەر قاڵکردن نیە لەشتە بێ سودەکان و ڕووتێکردنە بۆ خواو گەرم و گوریە بۆ بانگەواز.

بەڵام ئەمە سەرەتایە لە کاتێك زۆر لە بانگخوازەکان گومانیان برد ،کە ئامانجە . .

لەنێوان گەرم وگوڕی گڕگرتوو بۆئیسلام و نێوان هێنانە دی داواکاریەکانی ئیسلام لەدەروونەکانو واقیعداو خۆ کردنە سەربازی خەڵکی بۆی بەهۆشمەندیو چاوساغی ،ئەوا ماوەیەکی دوورو درێژ هەیە ، کە پەروەردەکردنی لەسەر خۆو ئارام و ئامانج گرو درەوشاوە دایدەپۆشێ . .

هەر چۆنێك بیت ناکرێت تێکرای ئوممتێك بەیەك جاری پەروەردە بکرێت ، کۆششو مانووبوونی پەروەردە هەرچەندە زۆر بێت – ناکرێت– هەموو تاکێك لەئوممەت بەچەشنێکی ویستراو پەروەردە ببێت . چونکە ئەمە ڕووی نەداوە لەهیچ کۆمەڵگایەك لەکۆمەڵگاکانی جیهان ، هەتا ڕووی نەداوە لەو کۆمەڵگایەی ، کەگەورەترین پەروەردەکەر محمد– صلی الله علیه وسلم– لەهەمووو مێژووی مرۆڤایەتی دایمەزراند ، کە لەو کۆمەڵگایەدا دوو ڕووی تێدابووە ، تێی دابوە بەئەنقەست خۆی لە جیهاد دواخستوە، تێی دابوە خۆی بەزەویدا نووساندوە لەتەمبەڵیان لەمەڕ جیهادکردن ، خەڵکێکی باوەڕ کزی تێدابووە ، خەڵکێکی سادەوساکارو گێلی تێدابووە ،کە هێندراو نێردراو هەلی فریواندوون ،هەروەکو،کەوەسفی هەموو ئەوانە لە قورئان داهاتوە ﴿ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢﴾ ﴾المنافقون:١ - 2

وەختێ دووڕوو دێنە لای تۆ ،ئێژن :شایەتیت بۆ دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خودای ،خوداش دەزانێ کە تۆ پێغەمبەری ئەوی وخوا گەوا هەکە –بەڕاستی – هەرچی دووروون درۆزنن .سوێندی خۆیان کردۆتە قەڵغان خۆیان و لەمپەرن لەڕێگەی خوداو ئاکاریان زۆر نالەبارە .

﴿ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَىَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنْ أَصَٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧٣﴾ ﴾ النساء: ٧٢ - ٧٣: هێندێکی واتان لەناو دان کە بەئانقەست خۆوە دوادەداو ناو گاتێ .ئگەر ئەوسا ئێوە تووشی چورتمێك بن ،ئێژێ :خودا منی بەچاکە خوێندەوە کەمن دەگەڵیاندا نەبووم.ئەگەر ئێوە لە سایەی چاکەی خوداوە دەسکەوتی باش و دوست کەوت ،وەك کەسێکی کەدەپێشدا هەر یەکترو نەناسیبێ و دۆستایەتیتان نەبووبێ،ئێژێ:خۆزی منیش ڕە گەڵیان کەوتبام ،ئەوسا منیش لەو خێرو بێرە گەورەیە بەشدار دەبووم .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ التوبة: ٣٨ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان ! چیتانە کە پێتان ئێژن :وەدەرکەون بۆ خەزا لەڕێی خودادا ،تەمەڵن لەجێی خۆ نابزوون ؟ ئاخۆ ژیانی دونیاتان لە قیامەتێ پێ خۆشترە ؟! گوزەرانی سەر دونیایە بەرامبەر بە گوزەرانی ئەو دونیتان شتێکی زۆر کەم بایەخە .

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً وَقَالُوا رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلَا أَخَّرْتَنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ لِمَنِ اتَّقَى وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾ النساء: ٧٧ ئاخۆ ئەوانەت نەدیوە ،پێان گوترا :هەتا لە مەککەن شەڕ مەکەن ،نوێژ بکەن و زەکات بدەن .کاتێ بیستیان خەزایان لەسەر نوسراوەو زانیان دەبێ بچنە شەڕێ ئەوەندەیان لەو خەڵکەی کە دەچنە گژیان ترس ڕێنیشت نکە لە خوداش هەر ئەوەندە ترساون وبگرە پتریش دەترسان؟دەیان گوت:ئەی پەروەرێنمان !بۆ چی خەزات بۆ نوسیوین چی دەبوو تا ماوەیەکی تر دوات خستباین ؟بێژە :ژیانی دنیایە کەم و کورتە بۆ ئەوانەی کە ترسیان لە خودا هەیە ،ژیانی ئەولا زۆر باشترەو بە قەد داوی زراوی ناو دنکە خورما،کەس نلا حەقی لێناکرێ.

﴿ وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَاتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾ ﴾ النساء: ٨٣ هەر گایەکی سەبارەت بە هێمنایەتی ،یان مەترسی ،دەنگ و باسێکیان پێدەگا سەر بەخۆ لەلای هەموو کەس دەیکەنە قاو .گور هەر لەلای پێغەمبەرو کاربەدەستەکانی خۆیان بیانگوتایە ،دەیانزانی ڕاستە قینەکەی کامەیە وئەو جۆرە دەنگ و باسانە لەکوێوە سەریان هەڵداوە.ئەگەر چاکەو بەزەیی خواتان نەبوایە ،کەمتان نەبێ دەبوونە پەیرەوی شیتان.

بەڵێ . .بەڵام ئەو بنکەیەی ،کە پێغەمبەر – صلی الله علیه وسلم – لەبەرچاوی خۆی پەروەردەی کرد لەماوەی سیانزەساڵ لەمەککەو دەساڵ لە

مەدینە زۆر بەهێزو پشت قایم بوو ، باوەڕ زۆر لەناخیان چووبووە خواریٚ بەجۆرێك ،کەتوانی هەموو ئەو شتانە هەڵبگرێتو بیان جولێنێت بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجەی ،کەخوای گەورە ئەو ئوممەتەی لەبەر خاتری هێناوەکایەوە : ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴿١١٠﴾ ﴾ آل عمران: ١١٠: ئێوە چاكترین كۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا سەرو هەڵدا، فەرمان بەچاكە دەدەن و ڕیٚ لە ناڕەوا دەبەستن باوەڕیشتان بەخودا هەیە.

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة: ١٤٣ بەم ئاوایە ئێمە ئێوەمان كردۆتە ئەممەتێكی هەڵبژاردە ،تا ئاگكاو لەمەردم هەبیٚ وپێغومبەریش چاودێری تان لێبكات .

دامەزراندنی بنكەیەكی بتەو پێویستە كاری یەكەم و هەرەگەورەی بزاڤی ئیسلامی بێت پێش ئەوەی ببزوێت بۆ هەر ئاڕاستەیەك . .ئەو بنكەیەش – پاش دامەزراندنی بە مواسەفاتی داواكراو – هەر ئەوە دەبێتە ڕابەری ئەو ئوممەتە بۆ ئەوەی دەریان بێنیٚ لەسەرگەردانی . .

ئەگەر بێتو ئەمە ئێستای بانگەواز بێت و، ئێستای جیهانی تۆپەڵ بێت ، كە ئەمڕۆ دەیانەویٚ بەو هەڵوێستە هارو گەرمەیان ئیسلام لەناو ببەن . ئەوا بەیانی پێش بینی چ دەكریٚ. .؟

ئەوەی پێش بینی دەكریٚ – لەمیانی ئەو چەوساندنەوە جیهانیە بۆ ئیسلام – ئەوەیە ،كە بانگەواز پێبگاو تۆكمە ببیٚ!

ئەمەش سوننەتێكی خوایەو ، خوا هەڵیدەسوڕێنیٚ لە میانی گەمژەیی تاغیەكان لەهەموو مێژوودا :

﴿ وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمْحَقَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ ﴾ آل عمران: ١٣٩ - ١٤٢: **باسستی ڕووتان تیٚ نەکاو خەمێش مەخۆن .هەر ئێوە کە سەر دەکەون .ئەگەر بڕواو بەخواهەیە .ئەگەر ئێوە بریندار بوون ،دوژمنانیش وەك ئێوە بریندار بووە .ئێمە ئاوا لەناو خەڵکا زەمانە دەستاو دەست دەکەین ،هەتا خودا خاوەن باوەڕان بناسیٚ و کەسنێکیش بۆ شایەتی لەبەینتانا هەڵبژێریٚ.خودا خۆشی لەنهەق کاران نایە. هەتا خودا باوەرداران هەلأوێریٚ و بیٚ باوەڕان لەناو بەریٚ .ئاخۆ ئێوە لاتان وایە هەر سەر بەخۆ دەچنە بەهەشت ؟ کەچی هێشتا خودا خەباتکارانو خۆڕاگرانی ئێوەی دیاری نەکردوە .**

**لەمیانی واقیعدا برازاڤە ئیسلامیەکان دەزانن ،کە دوژمنان ناجەنگێن لەگەڵ خودی یەك کۆمەڵدا لەبەر چەند هۆکارێکی شاراوە لەناو ئەو کۆمەڵە ، بەڵکو لەگەڵ هەموو ئیسلامدا دەجەنگێن ، لە هە وێنەیەك لەوێنەکانی بێت – لەخواش بەزیاد بێت – ئەوەی پێش بینی دەکریٚ لەو جەنگە گشت گیرە ئەوەیە ،کە کۆمەڵە لەیەکتر دوورەکان لەیەکتری نزیك بکاتەوەو، پلەپلە ئەو جیاڕاییەی لە نێوانیاندا هەیە لای بدات ،کاتێك هەموویان خۆیان لەناو یەك خەندەقدا دەبیننەوەو دوژمنانیش لەهەموو لایەك گەمارۆیان داون.**

**لەمیانی واقیعدا برازاڤە ئیسلامیەکان دەزانن،کە زانیاری بە داخوازیەکانی لااله الا الله شتێکەو هەڵسان بە هێنانەدی لەناو دەروونو پاشان لەواقیعو**

کۆمەڵگادا شتێکی ترەو جیایە ،هەروەها پاشان پێناساندنی خەڵکی بە داخوازیەکانی لاالەالاالله – لەگەڵ ئەوەی گرنگیشە – بەس نیە ! بەڵکو ئەوەی داواکراوە ئەوەیە ،کە ئەو داخوازیانە لەدەروونو واقیعدا بێتەدی ، ئەمەش کاری پەروەردەیە ، کە نابیٚ دەست بەرداری بێت و، جگە لە پەروەردەکردنیش – بەلایەنی کەم بۆ بنکەکە– بەردەوام بزاڤەکە دەبێتە چەند دورشمێکی بیٚ واقیع و، لەلایەن خواوە شایەنی جێگیر بوون نابێت و خەڵکیش قەناعەتی پێناکات ،کەبتوانیٚ گۆڕان کاری بکات!

لەمیانی واقیعەوە بزاڤە ئیسلامیەکان دەزانن ،کە دەبیٚ هۆشیاریەکی سیاسی وایان هەبێت ،کە ڕێگر بێت لە هەر خەڵەتاندنیٚ بۆ هەموو ئەوانەی پڕوپاگەندە دەکەن بەوەی تۆبەیان کردوەو گەڕاینەوەو بووینە پێشەوا بۆ موسوڵمانان ! یان وا خۆی نیشان دەدات ،کە دژی ئەمریکاو ئیسرائیل ڕاوەستاوە لەکاتێك لە سەرووی بەکریٚ گیراوەکانو پیلان گێڕەکانە! هەروەها هۆشیاریەکی بزاڤی تریش ڕێگر بێت بۆ ئەوەی نەکەوێتە ناو هەڵدێرانێك ،کە دوژمنان ڕای دەکێشنە ناوی بۆیە دەبیٚ ئیقاعی بزووتنەکەی ڕێك بخات لەگەڵ پێداویستی ڕووداوەکان . .

کاتێك بزاڤەکە لەلایەنی فیکریو ئەخلاقیو حەرەکی پێدەگات ئەوا وای لێدێت پتەوتر دەبێت لەوەی فڕو فێڵی دوژمنان کاری تیٚ بکات ، چونکە ئەو کاتە لەسەر ئەومەرجەیە, کە خوا بە مەرجی داناوە ﴿ إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا ۖ وَإِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا ۗ إِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿١٢٠﴾ ﴾ آل عمران: ١٢٠: تاچاکەیەکتان بێتەڕیٚ ،خەمیٚ

دەخۆن .ئەگەر توشی ناخۆشی بن ،کەیفیٚ دەکەن ئەکەر ئێوە خۆڕاکرو پارێزگاربن ،کزی و فێڵیان هیچ زانیان لەئێوە نادات خوا بە کردەیان دەزانیٚ.

هەرچی دوژمنانن ئەوا شتێککی تریان هەیە. .

ئەمرۆ ئەوان – لەهەموزەوی دا – چەند تاغوتێکی زۆر دارن و فرو فێیلٚ لە ئیسلام دەکەن بەهەموو ئەو شتانەی خاوەنینە لە هۆکارەکانی فروفێڵ کردن ئەمە چ جای هێزی سیاسیو سەربازیو ئابووریو زانستیو تەکنەلۆژی ،کە لەدەست ئەوانە.

بەڕاستی واقیعەکانی مێژوو فێری کردووینە ئەویش هێنانەدی سوننەتەکانی خوایە لەسەر زەوی ،کە ئەمانە هەموو بەبیٚ بەها ناژیت !– ئەو هۆکارانەش – بەگوێرەی سوننەتی خوا ماوەیەك نارەوا جێگیر دەکات ،پاشان لە کۆتایی دا نارەوا دەروخیٚو هەرەس دێنێت ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ الأنعام: ٤٤ - ٤٥: جا وەختیٚ ئەو هەموو ئامۆژگاریانەیان– کەکرابوون– لەبیروە چوو،هەموو دەرگای بەختەوەرین بۆ کردنەوە هەتا کەوتنە،ئەوسا لە پرو ناکاوێك بە تورەیی خۆمان خستن و هەموو نائومێد مانەوە .ئیتر ئوسا ئەو کەسانە پیشەیان هەر ناهەقی بوو ،دوابڕاو بوون و سوپاس بۆ خودای ڕاهێنەری هەموو دونیا.

بەڕاستی نارەوا لەنیوەی زەویدا هەرەسی هێناوە ئەو پاش ماوەی لەزەویدا بەجێماوە ئەوا دارمانو هەرەس هێنانی زۆر زۆر نزیك بووە . .

بەدیلیش، ئیسلامەکەی خوایە, کە هەڵگری بەهایە.. نرخی هەرە گرنگیش تیادا باوەڕ بەخوا بوونە لەسەر ڕێنمایی‌و چاوساغی ، هەروا ڕێکخستنی ژیانە بە ڕێکخەری خوایو هێنانەدی ڕێبازی خوای پڕ خێرو پیرۆزە لە واقیعی ژیاندا . .

بەڵام بۆ هێنانەدی ئەمانە هەمووی ،هەر دەبێ مرۆڤ کۆشش‌و ماندوو بوون بکات ، چونکە بەبێ کۆشش‌و مانوو بوون‌و جیهادکردن هیچ شتێك لەواقیعی زەوی نایەتەدی . .

لەبەیانیەکی بەهیواو ئومێددا دووگروپ لەمرۆڤەکان بەم کۆشش‌و ماندووبوونە هەڵدەستن ، یەکێکیان ئەو ڕابوونەیە ،کە ئەمرۆ لە جیهانی ئیسلامیدا خۆی دەنوێنێ ،کە بەگوێرەی سوننەتی خوا هێزو پێگەیشتنی زیاد دەکات بەهۆی ئەو قەسابخانەو چەوساندنەوانەی دەکرێتەسەری . . گروپەکەی تریش ،کە ئەمڕۆ خەڵکی زۆر حیسابی بۆ ناکاتو ، قەدەرێکە لەقەدەرەکانی خواو لەو کاتە دێت ، کەخوا دایناوە بۆی ، ئەوانەش ئەو موسوڵمانانەن ،کە لەخودی رۆژئاوادا هەن ، ئەوانەی بەردەوام ژمارەیان لە زیاد بووندایە ، ئەوانە یەکێکن لە ڕۆشنبیرە چالاکەکانی رۆژئاوا لەکێڵگەی بانگەوازدا ، کە لەنێویاندا بەتایبەتی ئافرەتان ، کە بەواقیعەکەیان تەحەددای هەموو درۆو دەلەسەکانی رۆژئاوادەکەن لەمەڕ ستەمی ئیسلام بۆ ئافرەتو بەواقیعەکەیان ڕایدەگەیەنن ،کە هەر ئیسلامە گەورەترین ڕێزو پایەو قەدر پێش کەش بە ئافرەتان دەکات .

لەو کاتەی ،کەدانراوە لەلای خوا ئەو جەنگە جیاکەروەیە ڕوودەدات ،کەئەمڕۆ نیشانەو دیاردەکانی لەزیادبوون دایە.

﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ لِيَسُـُٔواْ وُجُوهَكُمۡ وَلِيَدۡخُلُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوۡاْ تَتۡبِيرًا ﴿٧﴾ ﴾ الإسراء: ٧. هەر کاتێ بەڵێنی

پاشین هاتە جێ ، دیسان دەرینە سەرتان ،واتان لێکەن پەژارەو خەم لەڕوخسارتانا دیار بێ و تا بشچنە مزگەوتەوە – وەك جاری – هەر چێکیشیان – دەسکەوێ تەفرو توونای کەن ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ جِئۡنَا بِكُمۡ لَفِيفٗا ﴾ الإسراء: ١٠٤ : هەر دەمێکیش سەلاّ ڕابوو ،ئوجا گشتوو پێکەوە کۆدەکەینەوە.

((لاتقوم الساعة حتى يقاتل المسلمون اليهود ،فيقتلهم المسلمون ،حتى يختبى اليهودى وراء الحجر واالشجر ،فيقول الحجر والشجر يامسلم يا عبدالله !هذا يهودى خلفى فتعال فاقتله [1]: ڕۆژی قیامەت دانایێ هەتا موسوڵمانان کوشتار لەگەڵ جولەکەکان نەکەن جاموسوڵمانەکان دەیان کوژن ،هەتا جولەکە خۆی حەشار دەدا لەپشت دار و بەرد،جابەردو دارەکە دەلێن : ئەی موسوڵمان ئەی بەندەی خوا ئەوا جولەکەیەکم لەپشتە وەرە بیکوژە))

جا لەوکاتەدا مێژوو دەگۆڕێو .. خەڵك پۆل پۆل دێنە ناو دینی خوا هەروەکو،کە جاری یەکەم هاتنە ناویەوەو ،خواش خولێکی تر بۆ ئیسلام لەزەویدا جێگیر دەکات : ﴿ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ يوسف: ٢١ : خوا لەسەرکاری خۆی زاڵە ،بەلاّم زۆربەی ئەم مەردمە لێ نازانن

(1 ) اخرجه مسلم

